# حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی

## لە نێوان فەرمانڕەوایی و ستەمکاریدا

نوسینی:
قاسم محسن عولا



٢٠٢٤م
١٤٤٦ھ

پێشەکی :

إن الحمد الله نحمده ونستعينه و نستغفره ونعوذ بالله من شرر أنفسنا و سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له ، أشهد أن لا اله إلا الله وحده لاشريك له ، واشهد أن محمد عبده و رسوله أما بعد :

قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ [آل عِمۡرَان : ١٠٢]

قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ [النِّسَاء : ١]

قال تعالى:﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠﴾[الۡأَحۡزَاب : ٧٠]

قال تعالى: ﴿يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ [الۡأَحۡزَاب : ٧١]

قال تعالى: ﴿قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ٢٥ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ٢٦ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ٢٧ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ٢٨﴾ [طه : ٢٥ - ٢٨]

سوپاس و ستایش هه ر بۆ (خوای گەورە )یە ، سوپاسی دەکەین و پشتی پێ دەبەستین ، وە پەنای پێ دەگرین لە خراپەی دڵ و دەروون و کردەوەکانمان ، هەر کەس (خوای گەورە ) ڕێنموویی بکات ، ئەوا گومرا نابێت و هەر کەسیش گومرا بکات ئەوا ئەوا ڕێنموویی کە فریای ناکەویت ، وە گەواهی یان شایەتی ئەدەم کە هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله تعالى ) و ﷺ یش بەندە و پەیامبەری خوایە .

پێش هەموو شتێك پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کەوا ئەوەی کەبووە هۆکار و پاڵنەری بۆ ئەم پەرتووکەم ، کە باس لە فەرمانڕەوایەکی مێژوویی و ستەم و زوڵمی کەسایەتیەکی ئیسلام، ئەویش (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) ، ئەوە بوو ڕۆژێك بیرم کردەوە کە پەرتووکێك بنووسم لەسەر حکم فەرمانڕەوایی زولم ستەمی (حجاج ) ، هەر بۆیە منیش ئەرکێکی بەرپرسیارەتیم پێ سپێدرا بوو لە دامودەزگاکانی دەولەت وەك ئەمانەتێك ، بیرم لە حکم دادگەری کردوە کە چۆن داد پەروەری ئەنجام بدەم ، وە چۆن ئەو ئەمانەتەم وەکو چاوی خۆم پاراستەوە یان لە کوێدا کەم تەرخەم بوومە ، وەیان چۆن وەکو حجاج  کوێرایەلی خەلیفە (عبدالملك کوری مروان ) بووە ، هەروەها پەندو ئامۆژگاری عبیرەت لەم باسەی مێژوویی یە  دەسەلاتی (حجاجی کوری سەقەفی ) وەر بگرین ، بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایەکی پاش و تەندروست بێتە ئاراوە بۆ موسلمانان بەگەشتی و بۆ خەلکی کوردستان بە تایبەتی ، چونکە هەر یەکەو لە شوێنی ئەرکی خۆی فەرمانڕەوایە یان هەریەك لە شوێنی خۆیدا ئەمانەتێکی ئەم نشتیمانەی پێ سپێردراوە ، نابێت خیانەت و ناپاکی بکات لە کارەکەی یان لەو ئەرکەی کە بە ئەمانەت وەری گرتووە ، بۆیە دەبێت مرۆڤ پێش ئەوەی لێ پرسینەوەی لەگەل دا بکرێت ، ئەوا بە خۆی سەرزەنشتی خۆی بکات و لێ پرسینەوە لە نەفسی خۆی بکات ، چونکە ئەگەر لە دونیاش لێ پرسینەوەی لەگەل دا نەکرێت ، بەلام لە قیامەتدا  سەرزەنشت و لێ پرسینەوەی لەگەل دە کرێت ، پێ دەلێن : چون ئەم دەسەلاتەت لەدونیادا بەکار هێنا ...؟!

## ناو نەسەبی شوێنی لە دایك بوونی

ناوی تەواوی : (الحجاج کوری یوسف کوری الحکم کوری ابی عقیل کوری مسعود کوری عامر کوری متعب کوری مالك کوری کعب کوری عمرو کوری سعد کوری عوف کوری سەقیف ، ئەویش قسی کوری منبه کوری بکر کوری هوازن ابو محمد سەقەفی ) .

ناوی دایکی (فاریعەی کچی هومامی عوروەی کوری مسعودی سەقەفی ) .

لەدایك بوونی (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) لە نێوان مێژوو نووسانی ئیسلامی جیاوازی هەیە لە سالی لە دایك بوونی (حجاج ) هەندێك دەلێن : لە سالی (٣٩ هـ) هەندێکی تر دەلێن : (٤٠ هـ) هـ هندێکی تریش دەلێن: لە سالی (٤١ هـ) لە دایك بووە ، بەلام ئەوەی زیاتر کۆدەنگی لەسەر سالی (٤١ هـ ) لە کتابی (البدایه والنهایه ) ابن کثر ، دهاتووە ..؟!

ناوی (حجاج) لە چیەوە هاتووە ..؟! (حجاج ) واتا ئەو کەسەی کە زۆر حەج دەکات ، یان ئەو کەسەی هەمووکات بەلگەی بەهێزی پێ یە وەلامدانەوەی قسەکانی ، وە مانایەکی تریش هەیە ئەوەیە یاخود ئەو سەگەی کە ئێسقانی زۆر دەشکێنێت یان (سەگی هار ) تێبینی / ئەوەی کۆتایی لە حجاج کوری ویسفی سەقەفی نزیکترە چونکە زۆر خەلکی ئەشکەنجەو ئازارداو یان زۆر ئێسقانی خەلکی شکاندوە ..؟!

شوێنی لە دایك بوونی (حجاج ) لە ولاتی حجاج لە شاری (طائف ) کە ولاتی سعودیە ئێستا دەکا، کە لە سالی (١٤هـ) لەدایك بووە ، هەر لەم سالە دا موسلمانان کۆدەنگ بوون لە سەر ئەوەی کە (معاویەی کوری سفیان ) وە خەلیفە ی موسلمانان ، پاش ئاشت بوونەوەو رێکەوتن لە گەل (حسن ی کوری علی ) — خوا لێ یان رازی بێت —

## ڕەوشی جیهانی ئیسلامی

بەڵێ پاش کۆچی دوایی (یزیدی کوری کوری معاویە ) ئەوە بوو دووبەرەکی لە دەولەتی ئەمەوی زیادی کرد ، تەنانەت ئەمەویەکان ئەوە بوو کە کۆبوونەوەیان بەست بۆ بەیعەتدان بە (مروانی کوری حەکەم ) و ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی کە (خالدی کوری یزیدی کوری معاویە ) و پاشان (سعیدی کوری عاص ) ببنە جێنیشین لە پاش (مەروان ) ..؟! بەلام (مروانی کوری حکم ) ئەم ڕێکەوتنەی هەلوەشاندەوە ، وە بەیعەتی بە (عبدالملك )ی کوری دا پاشان ئەویش (عبدالعزیز )ی کوری دا ، چاوی داخست لە ئاست (خالدی کوری یزید) بەلام ماوەیی خەلیفایەتی (مروانی کوری حکم ) درێژەی نەکێشا و چەند مانگێکی خەیاند ،ئیدی دەلەتی ئیسلامی دابە بوو بۆ دوو خەلافەت : یەکەمیان : (عبدالله کوری زوبیر ) بوو کە ولاتی حیجازو ولاتی عێراقی لەخۆدەگرت،دوومیان : (عبدالملك کوری مروان ) بوو کەپاش کۆچی دوایی باوکی فەرمانڕەوایی گرتە دەست ئەویش تەنها ولاتی مصر و ولاتی شامی لە خۆ دەگرت ، بەلام (عبدالملك کوری مروان ) سەرکەوتوو بوو لە گرتنە دەستی جەلەوی فەرمانڕەوایی خیلافەتی ئەمەویەکان دا ، هەر لەم سەردەمەدا لە شاری کوفا ( (مختاری کوری عبیدالله ی سەقەفی ) دەرکەوت لە دەوربەریشی شیعەی عەلەویەکان لێ کۆبوونەوە ، ئەوە بوو ئەمانە بە شوێن بکوژانی (حسین کوری علی ابو تالیب ) کەوتن زۆریشی لێ کوشتن ، لە سەرووی هەمووشیانەوە ئەوە بوو (عمری کوری سعدی ابو وەقاص ) ڕابەری ئەو سوپایەی کرد کە ئەوانەی جەنگیان دژی (حسین کوری علی ) کرد بوو ، ئەوە بوو (عبیدالله کوری زیاد ) کە سەرکردەی سوپایەك بوو لە عێراق سەر بە ئەمەویەکان بوو ، ئەوە بوو کوشتیان ، بەلام ئاشکراشە کە (محمدی کوری حەنیفە ) کە زانایەکی لە خواترس بوو ، نەی دەویست بەیعەت بدات بە هیچ کام لەم دوو خەلیفەیە وەکو (کوری زوبێر ) و (کوری مروان ) چونکە پێ وابوو ئەگەر هەموو خەلکی بەیعەتی دا ئەوا ئەویش بەیعەت دەدا ، هەروەها (عبدالله ی کوری عباس )یش هەر بەم جۆرەی کرد ، بەلێ ئەوە بوو (عبدالله کوری زوبێر ) برایەکی خۆی ناردە بۆ ولاتی عێراق ، بە ناوی (موصعەبی کوری زوبێر )بوو بۆ ئەوەی ببێتە فەرمانڕەوایی ولاتی عێراق ، وە فەرمانیشی پێ کرد بە لە ناو بردنی (مختاری کوری عبیدالله ی سەقەفی ) ، هەروەها (موصعەب کوری زوبێر ) بە سەری سەرکەوتوو بوو ، ئەوە بوو (مختاری )

لە شاری کوفا کوشت ، ئیدی ولاتی عێراق و حیجاز کەوتە دەستی (عبدالله ی کوری زوبێری ) یان (ابن زوبێر ) ، بەلام ولاتی مصر و شام کەوتە دەستی (عبدالملك ی کوری مروان ) ..؟!

بەلێ لە سالی (٧٠) کۆچی دا ، ئەوە بوو (عبدالملك کوری مروان ) چوو بۆ ولاتی عێراق بۆ ئەوەی لە (ابن زوبێر ) بستێ نێتەوە ، کە (موصعەب کوری زوبێر ) تێدا فەرمانرەوایی دەکرد ، کە برای (ابن زوبێر )بوو ، لە دوایی چەندین چەنگی یەك لەدوایی یەك شەری گەرم روویدا ، لە دوا جاردا (عبدالملك کوری مروان ) تاوانی بە سەری دا زال بێت ، ولاتی عێراق لە (ابن زوبێر ) بستێنێت وە (موصعەب کوری زوبێر ) لە ناو بەرێت ، وە بچێتە شاری کوفا خەلکە کە بەیعەتیان دا بە (عبدالملك کوری مروان ) ئەوە بوو هەر لە لای خۆیەوە والی یان فەرمانرەوایەکی بۆ خۆی دنا ..؟!

## ژیان و کارو کرده‌وه‌کانی (ابن زوبیر )

به‌لێ کاتێ (کوری زوبیر ) شه‌هیدکرا ، ئه‌و کاته ته‌مه‌نی (٧٢) سال بوو ، خه‌لافه‌تی ئه‌و (٩)سالی خه‌یاند چونکه له سالی (٦٤)ی کۆچی دا ، که ده‌کاته سالی (٦٨٣-٦٨٤) زایینی بوو ، ئه‌وه بوو به‌یعه‌تیان دا به (ابن زوبیر ) ئه‌و کاته (ابن زوبیر ) قژی درێژ و په‌رێشان بوو ..؟!

(یحیی کوری وصاب ) ده‌لێت : کاتێك که (ابن زوبیر ) له کاتی نوێژدا سه‌ری داده‌نه‌واند و ناوچاوی ده‌خسته سه‌ر زه‌وی ، بالنده‌کان ده‌هاتن و له سه‌ر پشتی ده‌نیشتنه‌وه چونکه ئه‌ویان به دیوار و دار به‌رد ده‌زانی ، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له کاتی نوێژ کردندا زۆر ئارام و هێمن و له سه‌رخۆ خشوع و ته‌قه‌وایی زۆر بوو ، ناوچاوی بۆ ماوه‌یه‌کی زۆر له سووژده ده‌مایه‌وه له‌سه‌ر زه‌وی ..؟!

هه‌ندێکی تریش ده‌لێن ( ابن زوبیر ) شه‌وی بۆ سێ به‌ش دابه‌ش کردبوو ، شه‌وێك تا به‌ره به‌یانی له‌سه‌ر پێیه‌کانی راده‌وه‌ستا ، شه‌وێك تا به‌ره‌به‌یانی  رکوعی ده‌بر ، شه‌وێك تا به‌ره به‌یانی سووژده‌یی ده‌برد ..؟!

ده‌سته‌یه‌کی تریش ده‌لێن : یه‌که‌مین کار که (ابن زوبیر ) کردی ئه‌ویش بوێری نیشاندا ، ئه‌وه بوو که رۆژێك له گه‌ل مندلاندا گه‌مه‌ی ده‌کرد ، پیاوێك هات و تێپه‌ری و به‌سه‌ر ئه‌واندا قیژاندی که به‌لاوه‌یان لێکرد و رایان کرد ، (ابن زوبیر ) رۆیشت دواوه  ووتی : من بکه سه‌ر کرده‌ی خۆتان، تا هێرش بکه‌ینه سه‌ر ئه‌م پیاوه ..! ! ئه‌و کاره‌یان کرد ، (عمری کوری خه‌تاب ) – خوا لێ رازی بێت – لای (ابن زوبیر ) تێپه‌ری ئه‌و له‌گه‌ل منداله‌کان گه‌مه‌ی ده‌کرد ، مناله‌کان رایان کرد و ئه‌و له وشوێنه‌که‌ی خۆی مایه‌وه ، (عمر )  پێی ووتی : بۆ رات نه کرد ..؟! ئه‌ویش ووتی : نه گوناهێکم کردووه تا له تۆ بترسم نه رێگه ته‌نگ بووه تا رێگه‌ت بۆ بکه‌مه‌وه ..؟!

(فەتەن کوری عبدالله ) دەلێت : (ابن زوبیر ) جمعه بۆ جمعه به ڕۆژوو دەبوو ..؟!

(خالیدی کوری ابی عیمران ) دەلێت : (ابن زوبیر ) له مانگدا تەنیا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو نەدەبوو ، وه (٤٠) سال مایەوه وه جل بەرگەکانی دانەنا ..؟!

(موجاهید ) دەلێت : هیچ دەرگایەك له دەرگاکانی پەرەستنی خوای گەوره نەبوو کەلای خەلك دژوار بێت و (ابن زوبیر ) له دەرگای نەدابێت ، جارێکیان لافاوێك هات و کەعبەی پر ئاو کرد ، (ابن زوبیر ) به مەله کردن به دەوری مالی (خوای گەوره ) دە سووڕایەوه ..؟!

(هشام کوری عوروه ) دەلێت : یەکەم شت که مامم له منالیدا هەلیگرت شمشێر بوو ، (ابن زوبیر ) دەی ووت : تۆ بەردەوام کارت به شمشێر دەبێت ..؟!

دەگێرنەوه دەلێن : (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) ئەوه بوو (عبدالله ی کوری زوبیر ) واته: (ابن زوبیری ) له سێدارەدا ، له دوایی له سێداره دانیش لاشه یان جستەکەی له گۆرستانی جوولەکەکان فرێدا ، کەسێکی بۆ لای دایکی ڕەوانه کرد و بانگی بکات ، دایکی نەهات ، (حجاجی)ش پەیامی بۆ دایکی نارد ئەگەر نەیت ، ئەگەر نا پاسەوانه کانی خۆم ڕەوانه دەکەم تا به قژ بتهێنن ..!! دیسان دایکی نەهات ، ئیجا (حجاج ) ڕۆیشته لای پێ ووت : بینیت چیم له گەل (عبدالله ی کورت ) کردووه ..؟! دایکی ووتی : بینیم که ئەم جیهانەت لێ خراپ کرد ، وه ئەویش ئەم جیهانەی له تۆ شێواند ..!! وه پێغەمبەری خوا ﷺ پێ فەرمووین : له ناو هۆزی سەقەفیەکان دوو پیاو دەردەکەون ، یەکێکیان زۆر درۆزنه و ئەکێکی تریشیان مال کاولکەر ، وه (مختاری کوری عبیدالله سەقەفی ) درۆزنم بینی ..!! وه کاولکەرەکەش تۆێت ، واته(حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) ..؟!

## ڕووداوەکانی (حجاج ) و (ابن زوبیر )

بەلێ ئەوە بوو (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) چوو بۆ ولاتی شام لای (عبدالملك کوری مروان ) لەوێدا بەیعەتی پێ دا ، لە پاشاندا (عبدالملك ) لە گەل خەلکی شام چوو بۆ شاری کوفا (موصعەبی ) کوشت ، لەوێدا (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) هاورێ لەگەل دابوو ، وە لەگەل (٣٠٠٠) هەزار جەنگاوەر لە خەلکی شام ، ئەوە بوو (عبدالملك کوری مروان ) فەرمانی کرد بە (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) کە لە زێدی باب و باپیری خۆی بنکەیەکی بۆ کردەوە سەر بازگەی دروست کرد ، رەوانەی کرد بۆ ولاتی حیجاز ، کە جەنگ بکەن لە گەل (ابن زوبیر ) ، هۆکارەکەی (عبدالملك کوری مروان ) ئەوە بوو دەی ووت : من لە خەودا بینیم (ابن زوبیر )م گرت پێستیم دامالی ..؟! بەلێ (حجاج ) بە (عبدالملك ) ی دەووت : من رەوانە بکە بۆ حیجاز ، کاری ئەم جەنگە بە من بسپێرە ، ئەوە بوو (حیجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) کردە فەرماندەی سوپاکە ، کە لە سالی (٧٢) کۆچیدا بوو بەرانبە سالی (٦٩١) زایینی ، سوپاکە بەرێکەوت ئەوە بوو هیچ زیانیا بە شاری مەدینە نەگەیاند ، چوونە شاری (تائیف ) لەوێدا سەربازگەیان دانا ، ئەو بوو (حجاج ) هەندێك لە سوپاکەی بۆ عەرەفە رەوانە کرد ، (ابن زوبیر)یش ئەویش هەندێکی لە سوپاکەی خۆی رەوانە کرد ، بەلام لە ئەنجامدا سوپاکەی (ابن زوبیر ) لە هەموو جەنگە کان و شوێنەکان سەر نەکەوتن و شکستیان خوارد ، سوپاکەی (حجاج ) سەر کەوتن بە سەریاندا ..؟!

دواتر (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) نامەیەکی بۆ (عبدالملك کوری مروان ) نووسی دوایی لێ کرد تاگەمارۆ بخاتە سەر (ابن زوبیر ) لە شاری مککەدا ، ئەوە بوو (حجاج ) لە مککە گەمارۆیی خستە سەر (ابن زوبیر ) مەنجەنیقەکانی لە سەر کێوی (ابو قەیس جێگر کرد ، وە بەردو ئاگری بەسەر کەعبە دا باراند ..!! بەلام ئەوە بوو (عبدالملك کوری مروان ) بۆ ئەم کارە (یزیدی کوری معاویە)ی سەرزەنشت دەکرد بۆ ئەم کارە ، بەلام لەو سەردەمەی (حجاج ) خۆیان دووبارەیان کردەوە ، وە خەلکیش لەم سەردەمە دا دەیان ووت : لە دینەکەی ریسوا بووە ..!!ئەوە بوو جارچیەکانی (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) چاریاندا ، بۆ شارەکانی خۆتان بگەرێنەوە،واتە مەبەست لە حاجیەکانی شارە کانی تر، چونکە دەمانەوێت (ابن زوبیر ) بەرد باران بکەین ..؟!

به‌لێ یه‌که‌م به‌رد که بۆ که‌عبه هاوێژرا ، ئاسمان خرۆشا و زه‌وی کوتا و هه‌وره بروسکه یه‌کی لێکه‌وته‌وه ، خه‌لکی شام به کارێکی مه‌ترسیداریان زانی و ئه‌و کاره‌یان دووباره نه کرده‌وه ، ئا له‌م کاته‌دا (حجاجی کوری یوسفی سه‌قه‌ڤی )خۆی ده‌هات به‌ردی ده‌هاوێشته نێو مه‌نجه‌نیقه‌کان بۆ نێو که‌عبه ده‌ی هاوێشت ، کاتێك گه‌یشته به‌ره به‌یان هه‌وره بروسکه (١٢) که‌سی له سه‌ر بازه‌کانی (حجاج ) کوشت ، له کاته‌دا (حجاج ) ووتی : ئه خه‌لکانی شام ئه‌مه نه‌بێته هۆی سه‌ر سورمانتان ..! !من کوری ته‌هامم ئه‌م هه‌وره بروسکانه هی ئه‌وێیه نه‌بێته هۆس سه‌ر سورمانتان، مژده‌تان لێ بێت سه‌ر که‌وتن نزیکه بۆته‌وه و کاتێك به‌یانی هات ، هه‌وره بروسکه کۆمه‌لێك له سه‌ربازانی (ابن زوبیر) له ناو برد ، (حجاج ) ووتی : ئێوه سه‌ربازی خوان و ئه‌مانه خه‌لکانێکی تاوانبارنن ، نابینن چی یان به سه‌ر دێت یان چ به‌لایه‌کیان به‌سه‌ر دێت ..؟! هه‌روه‌ها (ابن زوبیر ) به راده‌یه‌ك بوێرو چاو نه‌ترس بوو له ژێر به‌رد باراندا نوێژ خۆی ده‌کرد به‌رده‌کان به‌ده‌ورو به‌ری ده‌که‌وتنه خواره‌وه ، ئه‌و هه‌رگیز نه‌ده ترسا رانه‌ده‌چله‌کی ، ئا له‌م کاته دا کۆمه‌لێك له بیابان نشینه‌کان هاتن و ووتیا: بۆ هاوکاری تۆ هاتووین ، شمشێریان له کالان ده‌رهێنا ، به‌لام (ابن زوبیر) ووتی : ئه‌ی کۆمه‌له‌ی بیابان نشین ، که‌ره‌سته‌کانی شه‌ری ئێوه باریکه ، باشان ئه‌وان بلاوه‌یان لێکر ، شه‌ر و جه‌نگ به‌رده‌وام بوو ، ئاله‌م کاته‌دا که ئابلوقه درابوون و شه‌ر گه‌رم بوو ، قات قری و برسیه‌تی له ناو خه‌لکدا ده‌ستی پێ کرد ، ئه‌وه بوو (ابن زوبیر ) وولاغه‌که‌ی یان ئه‌سپه‌که‌ی خۆی سه‌ر بری و گۆشته‌که‌ی به سه‌ر هاورێ کانی خۆی دابه‌ش کرد ، کاتێ کوشتی (ابن زوبیر ) نزیك بوویه‌وه خه‌لکی له ده‌وربه‌ری بلاوه‌یان لێکر ، راسته و خۆ روویان کرده (حجاجی کوری یوسفی سه‌قه‌ڤی ) خه‌لکی داوایی ئه‌مانیان له (حجاج ) کرد ، به نزیکه‌ی (١٠٠٠٠)هه‌زار که‌س له ده‌وربه‌ری (ابن زوبیر ) بلاوه‌یان لێکرد ، هه‌روه‌ها دوو کوره‌که‌ی خۆشی له ناو خه‌لکه که‌دا بوو ، که داوای ئه‌مانیان له (حجاج ) کرد ، که دوو کوره‌که‌ی (خوبه‌یب ) و (حه‌مزه) بوون ، به‌لام سێ یه‌م کوری که ناوی (عبدالله ) بوو ، (ابن زوبیر ) پێ ووت : تۆش برۆ وه‌ك دووبرا که‌ی خۆت ئه‌مان له (حجاج) وه‌ر بگره ..! !به‌لام (عبدالله ) ووتی : گیانی خۆم به له پێشتر دانانی له گیانی تۆ ...هتد

## گفتوو گۆی نێوان (ابن زوبیر ) و دایکی

بەڵێ کاتێ خەڵکانی (ابن زوبیر ) هەموو روویان لە (حجاج ) کرد ئەمانیان لێ وەرگرت پاشان (حجاج ) بۆ خەڵکی ووتاریدا ووتی : ئەی خەڵکینە دەبینن چ دەستەیەکی کەم لەگەڵ (ابن زوبیر ) و چۆن لەبەد بەختی و تەنگانەدا ژیان بەسەر دەبەن ، بەڵێ (حجاج ) پێشرەوی دەست پێکرد و نێوان (حەجون ) و (ئەبوا ) یان پر کرد ، پاشان (ابن زوبیر ) رۆشتە لای دایکی و ووتی : ئەی دایکە دەبینی کە هاورێکانم یان خەڵکەکەم بەجیێ یان هێشتوم وە تەنانەت کەسانی بنەماڵەکەم و کورەکانم لە دەوربەرم بڵاوبوونەتەوە بەجێ یان هێشتم ، وە جگە لە کۆمەڵە خەڵکێکی کەم نەبێت لە دەورەم ماوەنەتەوە ، وە زیاتر لە کات ژمێرێك ناتوانم خۆراگری بکەم ..!! ئەم خەڵکە ئەوەی لەم دونیام دەویست ، بەمن پێشنیاری دەکەن ، ئەی دایکە بۆ چوونی تۆچیە ..؟! دایکی ووتی : تۆ خۆت ئاگادارتریت باش دەزانیت ، ئەگەر دەزانی لە سەر رێگەی حەق راست و دروستیت و بانگەوازی ئەوە دەکەیت ، درێژە بەرێگەکەت بدە کە هاوەڵان لە سەر ئەم رێگەیە کوژران ..!!کە پیاو خراپانی بنی ئومەییە سوار ملی خۆت مەکە کە یاری یان گەمە بە چارەنووسی تۆ بکەن ، بەڵام ئەی کورەکەم ئەگەر بۆ دونیا شۆرشت کرد ئەوا بەندەیەکی خراپیت کە خۆت و هاورێکانت لە ناو برد ..؟! ئەگەریش دەڵێت : لەسەر حەق و راستی دروسی بووم و چونکە هاورێکانم یان خەڵکەکەم هاوکاریان نەکردم و لاواز بووم ، ئەمە شێوەی ئازادەکان و تەقوادار و دیندارەکان نیە ، کێ لەم جیهانەدا ماوەتەوە تا یەکێکبیت لەوان ..؟! کوژران باشترە لەم ژیانە ! (ابن زوبیر ) ووتی : دایکە دەترسم ئەگەر بکوژرێم ، جەستەم لەت لەت بکەن و لەدارم بدەن..!!

دایکی ووتی :کورم کاتێك مەر دەکوژن ئازار ناچێژێت کاتێك پێستەکەی دەدەماڵن ..؟! لەسەر بنەمای حەق و راستی و دروستی بۆ پیشەوە برۆ و داوای پشتیوانی و هاوکاری لە خوا بکە ..؟! ئەوە بوو (ابن زوبیر ) سەری دایکی ماچ کرد ووتی : راو بۆچوونی خۆشم ئەوەیە ، سوێند بەو کەسەس تا ئەمرۆ لەرێگەی ئەودا هەولمداوە ، هەر گیز خوازیاری ئەو ژیانە نەبووم و ژیانم خۆش نەویستووە ، ئەوەی بۆ ئەم کارە پالی پێوەنام جگە تورەیی لە رێگەی خوادا نەبوو چونکە دەمبینی پەردەی بارەگای خوایی دەدرێت و فەرمانەکانی پێشل دەکرێن ، بەڵام ویستم بۆ چوونی تۆ بزانم ، وە تۆ زیاتر منت وشیاکردەوە ، دایکە سەیرکە و بزانە ، ئەمرۆ من دەکوژرێم ، کەواتە : باخەم و پەژارە لە سەر شانی تۆ قورس نەبێ ..؟!

(ابن زوبیر ) ووتی : دایکە کاری خۆت بە خوا بسپێرە ، چونکە کورەکەت نەیویست وشیارانە گوناهێك ئەنجام بدات ، یان هەر کارو کردەوەیەکی قێزەون ئەنجام بدات ، یان فەرمانەکانی (خوای گەورەی ) پێشل نەکرد ، وەیان ستەمی لە ئەمانەت پارێزی نەکرد ، وە ستەمی لە خەلکی نەکردو ، وە وشیارانە و ئاگایانە ستەمی لە موسلمانێك نەکرد ، لە والی کاربەدەستەکانم هەوالی ستەمکاری بەمن نەگەیشت کە پێی رازی ببم یا شادمان بم بەلکو بە زمان و دەستم سەرکۆنەم کردووە ، بە راو بۆ چوونی من هیچ کارێك باشتر نیە لەوەی کە رەزامەندی خوای لە سەر بێت ، (ابن زوبیر ) ووتی : ئەی (خوی گەورە ) ئەمە بۆ پاك کردنەوەی خۆم نالێم ..!! بەلکو بۆ دلدانەوەی دایکم دیهێنمە سەر زمانم ..؟!

دایکی : ووتی : ئەی کورەکەم هیوادارم بە باشترین شێوە پرسەت بۆ بگێرم ، ئەگەر پێش من بۆ ئەو دونیا برۆیت، وە کوژرانی تۆ بەخوا دەسپێرم و ئەگەر سەرکەوتیت ، شادمان دەبم ، برۆ تا بزانم ئەنجامی کارەکەت بە کوێی دەگات ، (ابن زوبیر ) ئەی دایکە (خوی گەورە) پاداشتی چاکەت بداتەوە ، پارانەوە لە خوا بۆ من لە بیر مەکە ، دایکی ووتی: هیچ کات لە بیرت ناکەم ، ئەگەر کەسانیتر لە سەر رێگە ی خراپ و هەلە چەوت لاری کوژران ، بەلام تۆ لە سەر رێگەی حەق و راست و دروستی دەکوژێت ، ئیتر ئەوە بوو دایکی دەست کرد بە دوعا پارانەوە لە (خوای گەورە ) بۆ کورەکەی ، پاشان (ابن زوبیر ) دەستی دایکی ماچ کرد ، دایکی ووتی: ئەم مالئاواییە هەرگیز دوور نەبێت ، ئەویش بەدایکی ووت : بۆ مالئاوایی هاتووم چونکە ئەمە دوایین رۆژی ژیانی منە لەم جیهانە ، دایکی ووتی : لە سەر بنەمای زاناییت بۆ پێشەوە وەرە و لێم نزیك بە تا مالئاواییت لێ بکەم ، (ابن زوبیر ) لێ نزیك کەوتەوە ، دایکی ئامێزی گرت لە پاوەشی کرد و ماچی کرد ، دەستی بە زێرەکەی کەوت ، ووتی : درع پۆشین کاری کەسێکی وەك تۆ نیە کە مەبەستێکی گەورەی هەبێت ، (ابن زوبیر ) بەدایکی ووت: دەرعم نەپۆشی تەنیا لە بەر ئەوەی دلی تۆ پێ خۆش بکەم یان بە هێز بکەم ، دایکی ووتی : من وورەم زۆر بەرزە ، (ابن زوبیر ) درعەکەی دەرهێنا و قولەکانی هەلکرد و داوێنی عاباکەی خستە ناو شەروالەکەی خۆی ، دایکی بەردەوام دەی ووت : داوێنی جلەکانت بە بەهێز رابگرە ، هاتە دەرەوە ..؟!

## ده‌ست پێكردنی جه‌نگ له نێوان (حجاج ) و (ابن زوبیر ) له شاری مككه

به‌لێ شه‌ر جه‌نگ له نێوان سوپایی (حجاج ) و (ابن زوبیر ) ده‌ستی پێكرد ، ئه‌وه بوو دوایی ئه‌وه‌ی گفتوو گۆ له نێوان ( ابن زوبیر ) دایكی دا ته‌واو بوو ، (ابن زوبیر ) هێرشی به‌هێزی كرد سه‌ر سوپاكه‌ی (حجاج ) به‌تایبته‌ی خه‌لكانی ولاتی شام كه له گه‌ل (حجاج ) له سوپاكه‌ی دابوون ، ئه‌وه بوو ( ابن زوبیر ) له سه‌رتادا كوشتاری خه‌لكی شامی زۆر كرد ده‌ستی كرد به كوشتار كردنیان ، دواتر (ابن زوبیر ) هاورێكانی پاشه‌كشه‌یان كرد ، وه سوپاكه‌یان لێك پچران ، یه‌كێك له یارانی (ابن زوبیر ) پێی ووت : وا باشتر به‌ره‌و فلانه شوێن برۆیت ، (ابن زوبیر ) ووتی : ئه‌و سا ده‌بمه پیری ئاخر شه‌ر له ئیسلام دا ، كه خه‌لكی به كوشتن ده‌دم له‌كاتی كێشه‌و بلاو نصیبه‌ت دا ، ئه‌وه بوو جه‌نگه كه گه‌رم داهاتوو ، سوپایی (حجاج ) لیّ یان زۆر نزیك بوویه‌وه به جۆرێك كه ده‌رگاو مال كۆلانه‌كانی پر بوو له سوپایی (حجاج ) وه خه‌لكانی شام ، وه‌سوپای (حجاج ) هاواریان ده‌كرد ئه‌ی كوری (ذات النطاقين ) ، پاشان سوپای (حجاج ) كه‌وته نێو شاری مككه سه‌ر كه‌وتنیان به ده‌ست هێنا به‌سه‌ر (ابن زوبیر ) دا ، ئه‌وه بوو سوپایی (حجاج) بۆ هه‌ر ده‌رگایه‌ك له شار بۆ خه‌لكانێك ده‌ست نیشان كرد ، له كاتێكدا سوپایی (حجاج ) سه‌ر كه‌وت به‌سه‌ر (ابن زوبیر ) ئه‌وه بوو هه‌ندێك كات (ابن زوبیر ) هێرشی ده‌كرد سه‌ر ئه‌ملاو ، وه هه‌ندێك كات هێرشی ده‌كرده سه‌ر ئه‌ولا ، هاوشێوه‌ی شێری دارستان په‌لاماری سوپایی (حجاج)ی ده‌دا ، به‌لام ئه‌وان هێرشیان نه‌ده‌كرده سه‌ری ئه‌و هه‌ر هێرشی ده‌كرد له گه‌ل چه‌ند یاوه‌رێكی خۆی ، ئه‌و ده‌ی ووت خۆزه‌گه دوژمنه‌كه‌ی من یه‌كه‌س ده‌بوو ده‌متوانی شكستی بده‌م ، به‌لام ئا له‌م كاته‌دا (حجاجی كوری یوسفی سه‌قه‌ف ) كه سه‌ركرده‌ی سوپاكه بوو بۆ هێرش كردنه سه‌ر (ابن زوبیر ) ، ئه‌وه بوو (حجاج ) له دووره‌وه بینی كه‌وا خه‌لكی هێرش ناكه‌نه سه‌ر (ابن زوبیر )و یاوه‌رانی ئه‌و واته : (حجاج) زۆر تووره بوو ، له ئه‌سپه‌كه‌ی دابه‌زی خه‌لكی بۆ پێشره‌وی ناچار كرد ، ئاله‌م كاته‌دا ئه‌و كه‌سه‌ی ئالای (ابن زوبیر )ی هه‌لگرتبوو به‌رگری له (ابن زوبیر ) ده‌كرد ، له راستی دا كاتێك هێرشی ده‌كرده سه‌ر سوپای (حجاج ) شه‌كه‌ت ده‌بوو ده‌گه‌رایه‌وه شوێنی خۆی دوو ركه‌عه‌ت نوێژی ده‌كرد ، ئه‌وان دوو باره هێرشیان ده‌كرده سه‌ر یارانی یان ئالا هه‌لگره‌كه‌ی (ابن زوبیر ) كوشتیان ، له‌سه‌ر ده‌روازه‌ی بنی شیبه خستیانه خواره‌وه ، ئالاكه كه‌وته ده‌ست سوپاكه‌ی (حجاج) ...هتد

بەلام (ابن زوبیر ) كاتێك له نوێژ كردن تەواو بوو ، هێرشی بردە سەر سوپایی (حجاج ) بەلێ لەم كاتە دا پیاوێك خشتێكی یان بەردێكی هەلدا بە روخساری كەوت و بریندار و خوێناوی كرد و (ابن زوبیر ) لەرز دایگرت ، كاتێك خوێنی بەروخساریەوە بینی ووتی : ئێمە كەسانێك نین برین بەر پشتمان بكەوێت و خوێن بباریت بەلكو خوێن لەبەر پێماندا دەباریێت..! ! بەلێ ئازایانە دەجەنگا له گەل سوپاكەی (حجاج ) ئەویان شەهید لە رۆژی شەممەدا ..؟! له كاتی شەهید كردنی (ابن زوبیر ) تەمەنی (٧٣) سال بوو ، ئەگێرنەوە دەلێن : پیاوێك له موراد (ابن زوبیری ) سەر بری ..؟! پاشان سەری (ابن زوبیر) یان بردە پێش (حجاجی كوری یوسفی سەقەفی ) ستەمكار ..؟!(حجاج ) سەری خستە سەر زەوی سوپایی خوای كرد ،پاشان (حجاج ) دوو پیاوی كردە نێردراو بۆ لای (عبدالملك كوری مروان ) بۆ گەیاندی هەوالی شەهید كردنی (ابن زوبیر ) ، ئەویش واتە : (عبدالملك كوری مروان ) كەخەلیفەی ئەمەویەكان بوو ، پاداشتی كردن و (٥٠٠) درهەمیان پێ بەخشین ..؟! بەلام ئەوە بوو پاش شەهید كردنی (ابن زوبیر ) ، دواتر (حجاج ) و (تارق ) چوونە سەر لاشەكەی (ابن زوبیر ) ، لەو كاتە دا تارق ووتی : ژنان پیاوێكی بوێر ترتان له پیاوە گەورە نەبوو ، (حجاج) ووتی : دوژمنی سەروەری باوەرداران وصف دەكەیت ..؟! تارق ووتی : بەلێ . ئەو بیانو بەلگەی زیانر بۆ ئێمە كۆدەكاتەوە ، وە كارەكانی ئێمە باش وصف دەكات ، تارق ووتی : حەوت مانگە ئێمە گەمارۆمان یان ئابلوقەی (ابن زوبیر ) ماندوە بەم سوپا گەورەیە ، ئەو بە ژمارەی سوپا له ئێمە ژمارەیان كەمتر بوو ، نە قەلا یەكی هەیە و نە دیوارێكی هەیە نە بارەگایەكی جێگیر قایم ، بۆ بە هێز كردنی بەرگریان ، وە لە گەل ئێمەدا بەرگری دەكردو دەجەنگاو بەرابەری دەكرد ، وە لە پێش ئێمەشەوە بوو ، كاتێك ئەم ووتارەی (تارق ) بە گوێی (عبدالملك كوری مروان ) گەیشت ، ئەو (تارق ) ی بەراست گۆ زانی ..؟!

## ته‌واو بوونی جه‌نگ و به‌خاك سپاردنی ته‌رمه‌كه‌ی (ابن زوبیر)

به‌ڵێ كاتێك (ابن زوبیر ) شه‌هید كرا ، خه‌ڵكی شام له شادومانیدا ته‌كبیریان ووته‌وه ، (ابن عمر) ووتی: سه‌یری ئه‌وانه بكه..؟! موسڵمانان له كاتی له دایك بوونی ئه‌و ته‌كبیریان ووته‌وه ، وه ئه‌مان له كاتی شه‌هیدكردنی ئه‌و ..؟! پاشان (حجاجی كوری یوسفی سه‌قه‌فی ) سه‌ری (ابن زوبیر ) و (صه‌فوان ) و (عوماره‌ی كوری عمرو ) بۆ لای (كوری حه‌زم ) له شاری مه‌دینه روانه كرد ، دواتر ئه‌وانیان برد بۆ لای (عبدالملك كوری مروان ) لاشه‌ی ئه‌وی هه‌ڵگرت و له سه‌ر ته‌پۆلگه‌ی راست له (حجون ) له داریدا ..!! ئینجا دایكی (ابن زوبیر ) په‌یامی بۆ ره‌وانه‌كرد ، ووتی : خوا بتكوژێت ..!! بۆ چی له دارت داوه ..؟! (حجاج ) وه‌لامی دایه‌وه ووتی : من و ئه‌و به‌ره‌و ئه‌م داره رامان كرد ئه‌و خێراتر رۆیشت و به‌داره‌كه‌دا سه‌ر كه‌وت ..!! پاشان دایكی داوای له (حجاج) كرد تاكو كوره‌كه‌ی كفن بكات و به‌خاى بسپێرێت ..؟! به‌لام (حجاج ) رازی نه‌بوو ، چه‌ندین پاسه‌وانی بۆ دانا تا لاشه‌كه‌ی یان ته‌رمه‌كه‌ی له‌وێ كه له داری دابوو بیهێڵنه‌وه ..!!پاشان هه‌والی ئه‌م كرداره‌ی بۆ (عبدالملك كوری مروان ) نووسی ، به‌لام (عبدالملك ) وه‌لامی دایه‌وه سه‌ر زه‌نشت و سه‌ركۆنه‌ی كرد بۆ ته‌رمه‌كه‌ت نه‌دایته‌وه به دایكی ..؟! دواتر (حجاج ) فه‌رمانه‌كه‌ی (عبدالملك ) جێ به‌جێ كرد ، ته‌رمه‌كه‌ی (ابن زوبیر)ی داوه به‌دایكی ئه‌ویش (ابن زوبیر)ی له (حجون ) به خاك سپارد ..!! ئه‌وه بوو ده‌گێرنه‌وه (عبدالله كوری عمر ) به لای ته‌رمه‌كه‌ی (ابن زوبیر ) تێپه‌ری ووتی : سلاو له تۆ ئه‌ی باوكی (خوبیب ) سوێند به‌خوا من رێگه‌ی ئه‌م كاره‌م لێ گرتیت ، تۆ پیاوێك بوویت نوێژ خوێن و رۆژو گرو به هێزكه‌ری په‌یوه‌ندی خزمایه‌تی ، سوێند به‌خوا ئه‌و خه‌ڵكه‌ی تۆ خراپ ترین كه‌سیان بێت ، باشترینی خه‌ڵكانن ..؟! به‌لام ده‌گێرنه‌وه (ابن زوبیر ) پێش شه‌هیدكردنی ئارامگریی خۆی به سه‌ر روخساریه‌وه پرژاندبوو تاكو ته‌رمه‌كه‌ی بۆگه‌ن نه‌كات ..!! كاتێك ئه‌ویان له دار دا بۆنی خۆشب به هه‌موو لایه‌كدا بلاوبویه‌وه ، هه‌ندێك ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : (حجاجی كوری یوسفی سه‌قه‌فی ) بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌م بۆنه خۆش بلاو نه‌بێته‌وه ، چوو بوو سه‌گێك یان پشیله‌یه‌كی تۆپی له شوێنی له داردانه‌كه‌ی دانابوو ، بۆ ئه‌وه‌ی رێگری بكات له بۆنه خۆشه‌كه‌ی (ابن زوبیر ) ، ئه‌وه بوو (حجاج ) ته‌رمه‌كه‌ی (ابن زوبیری) دایه‌وه دایكی ئه‌ویش كه بینی كوره‌كه‌ی له‌ت له‌ت بووه ، شۆردی دایكی هه‌موو لاشه‌كه‌ی شۆرد ،(عورو‌ه‌ی ابن زوبیر ) واته : براكه‌ی نوێژی له سه‌ر كرد ..؟! هه‌ندیكی تریش ده‌لێن : (حجاج) رێگری كرد.؟!

## سەرەتایی دەرکەوتنی حجاجی کوری یوسفی سەقەفی

بەلی (حجاج) لە هۆزی (سەقەفی ) بووە کە هۆزیك بوونە لە شاری تائیف لە ولاتی حیجاز لە دایك بووە لە سالی (٤١) هـ کە ئەو سالەی موسلمانان کودەنگ بوون لە سەر ئەوەی کە (معاویه کوری سفیان ) بە خەلیفە ی موسلمانان هەلبژێرن بەیعەتی پیٚ بدەن ، وە پاش ئاشت بوونەوەی و رێکەوتن لە گەل (حسن کوری علی ) — خوا لیٚ رازی بێت — ..؟!

ووتراوە : (حجاج ) بە خۆی ناوی (کلیب ) بوو ، بە مانای (تووتکە سەگ ) یان ئەو (تووتکە سەگ) ئێسقان زۆر دە شکێنیٚ یان سەگی هار ، تێبینی ئەم ناوە زۆر لە (حجاج ) نزیکە چونکە ئێسك و بروسکی مرۆڤەکانی ئەم سەردەمی خۆی دەشکاند و خوێنی خەلکی دەرشت ستەمی زۆری ئەنجامدەدا ، هەلبەتە عەرەبەکان لە کۆندا ناوی ئاژەل یان لە مندالەکانیان دەنا ، ئەلێن : (حجاج ) پاشان ناوی خۆی گۆری لە (کلیب) بۆ (حجاج ) ئەمەش بەمانای ئەوە دێت کە ئەو کەسەی کە زۆر حەج دەکات یان ئەو کەسەی هەمیشە بەلگەی بە هێزی پیٚ یە بۆ قسەکانی ، هەر بۆیە لە بەسەر هاتەکان و رووداوەکانی (حجاج) لە گەل خەلیفەی موسلمانان (عبدالملك کوری مروان ) هەمیشە بەلگەی بە هێزی بۆ دەهێنایەوە ، چونکە قسە کەرێکی زۆر پاراو رەوان بێژێکی زۆر باش بووە لە قسە کردندا ، (حجاج ) کاتێك گەنج بوو ، لە گەل باوکی گەنج و مندالانی فێری قورئانی پیرۆز دەکرد لە شاری تائیف ، چونکە زۆر فصاحەی هەبوو لە زمانی عەرەبی دا ، هەروەها لە زانستی فەرموودەو زانستی فقهی زۆر شارەزابوو ، بەلام رازی نەبوو بەو کارە کە ئەنجامی دەدا لەگەل باوکی دا ، هەر لە شاری تائیف بە فێری کاری خوێندەوەی قورئانی پیرۆز ناوی دەرکردبوو ، لەم سەردەمەدا شاری تائیف کەوتبووە ژێر فەرمانرەوایی (عبدالله کوری زوبیر ) هەر لەم سەردەمدا خەلیفایەتی ئەمەویش بەردەوام بوو لە ولاتی شام کە (عبدالملك کوری مروان ) خەلیفە بوو ، بەلام لەم کاتەدا (حجاج ) ناکۆکی هەبوو لەگەل هاوەلانی (عبدالله کوری زوبیر ) ناچار بوو سەری خۆی هەلگرتو دەرچوو لە شاری تائیف چووە ژێری دەسەلاتی خەلیفایەتی ئەمەویە کان لە ولاتی شامدا ، چونکە ئەمەویەکان ناکۆکی دووبەرەکیان هەبوو لە گەل (عبدالله کوری زوبیر ) ، هەلبەتە ئەمەش هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی (حجاج ) سوود لەم ناکۆکی و دووبەرەکیە ببینیٚ لە نێوان (عبدالله کوری زوبیر ) و (عبدالملك کوری مروان ) ..؟!

بەلێ لە کاتی دەرکەوتنی لە شاری تائیف وەك (ابن كثير ) لە البداية النهاية دا هاتوو دەلێت : (حجاج) گەنجێکی قسەخۆش و قسەکەرێکی باش و حافزی قورئانی پیرۆز بوو ..؟! چونکە پەیوەندی لە گەل هۆزی (هوزيل ) دا هە بووە ، ئەوانیش رەوان بێژو و ووتار بێژو فصاحەی عەرەب بوون ، لە ( ابو عمر بن العلاء ) دەلێت : نەم بینیوە وەکو (حسن البصری ) و (الحجاج ) لە ناو عەرب لەم سەردەمەدا ئەوەندە فصاحە یان هەبێ ..؟! بێ گومان ( حجاج ) کۆچی کرد بۆ ولاتی شام لەوێدا چاوی کەوت بە فەرماندە پۆلیسەکانی (عبدالملك کوری مروان ) کە لە خەلیفایەتی ئەمەویەکان سەرۆکی پۆلیسەکان بوو ، ناوی ( روح کوری زنباع ) بوو ، وە ووتراویشە : (روح بن زنباع ) وەزیرێکی سەربازی (عبدالملك کوری مروان ) بووە یان فەرماندەیەکی سەر بازی بووە ، کاتێك (حجاج ) پەیوەندی بەم پیاوە سەربازیە دەکات ، ئەویش زیرەکی هۆشیاری و رێك و پێکی و قسە پاراوی (حجاجی) بۆ دەردەکەوێت ، بە کەسێکی زیرەك وقسە کەرێکی پاراوی دەزانی ، ئەوە بوو (حجاج ) دە کات بە پۆلیس یان سەر باز لە لای خۆی و قوناغ بە قوناغ پلەکەی بەرز دەرکردەوە شوێنی و پێگە کەی لە نێو سەر بازەکانی خۆی بەرز دەکردەو ، ئەوە بوو بەر پرسیاریەتی سەربازەکان و یان پۆلیسەکانی پێسپرادو ، ئەویش بە شێوەیەکی زۆر توند ئەرکەی خۆی جێ بەجێ دەکرد ، زۆر جەختی دەکردەوە لەوەی دەبێت سەربازەکان یان پۆلیسەکان دەبێن لە رووی جەنگاوەری زۆر توندو رێك و پێك و بێ کەم و کوری بن ، چونکە ئەو سەردەم خەلیفایەتی ئەمەوی کە (عبدالملك کوری مروان ) خەلیفەی بوو ، لەرووی سەربازی یان پۆلیسی بە چەندین کێشەوە گیرۆدەببوو ، لەوانە خراپی رێکستنی سوپاو بێ رێزی کردنی سەربازەکان بە فەرماندەکانیان ، وە کەمی دامەزراندنی سەر باز یان پۆلیس بۆ سوپاکەی خەلیفە چەندی کێشەی تریش ، ئەوە بوو (حجاج ) درکی کرد بەم کەم کوریانەوە ، ئەویش جۆش خرۆشی دیسبلینی سەربازی بە پۆلیسەکان یان سەر بازەکان نیشاندا ، وە خێراو توند لە جەخت کردنەوە و فەرمانکردنیان پیان سەرباز جەنگاوەرەکانی ئاگادار دەکردەوە لە هەلەو عەیب و کەم و کوریەکاندا ، خۆشی گوێرایەلی زۆر بە جدی بۆ خەلیفە دەگرت ، ئەوە بوو سەربازەکانی سزادەدا بە بچووکترین هەلە و کەم و کوریدا ، چونکە پێی وابوو نابێت هیچ سەربازێك هەلەو کەم وکوری خراپەی هەبێت ، بۆیە کۆنترۆلی سەر بازەکانی گرتبووە ئەستووی خۆی ، چونکە گوێرایەلی رەوای بۆ خەلیفەی موسلمانان رەهابوو لە هیچ فەرمانێکی دەر نەدەچوو ..؟!

## فه‌رمانره‌وایی حجاجی کوری یوسفی سه‌قه‌فی له‌شاری کوفا

له سالی (٧٥) كۆچی به‌رانبه‌ر سالی (٦٩٤)زایینی ، ئه‌وه بوو (عبدالملك كوری مروان ) فه‌رمانی كرد كه (حجاجی كوری یوسفی سه قه‌فی ) فه‌رمانداریه‌تی سوپای ده‌وله‌تی ئه‌مه‌وه‌ی له ئه‌ستۆ بگرێت ، كه سه‌رپه‌رشتی و فه‌رمانره‌وایه‌تی ئه‌م ولاتانه‌ی ده‌كرد ، وه‌كو فه‌رمانداری ولاتی عێراق و لاتانی خۆرستان و سیستان ، ئه‌وه بوو (عبدالملك كوری مروان ) كاتێك هه‌والی ده‌ستنیشان كردنی فه‌رمانداریه‌تی (حجاجی ) راگه‌یاند ئه‌و كاته له شاری مه‌دینه بوو ، هه‌ر له‌وێدا فه‌رمانی پێدا كه به‌ره‌و ئه‌م ولاتانه یان ئه‌م ناوچه‌یه به‌رێكه‌وێت و ئه‌وه بوو له كاتی نیوه‌رۆدا به شێوه‌یه‌كی كت پرو له ناكاودا گه‌یشته شاری كوفا له عێراق ، كه ئه‌و كاته (بشری كوری مروان ) و (موهه‌لیبی ) بۆ جه‌نگی خه‌واریجه‌كان ره‌وانه كردبوو ، ئه‌وه بوو له شاری كوفا (حجاج) كاره‌كانی خۆی له مه‌زگه‌وت ده‌ست پێكرد ، رۆیشته سه‌ر مینبری یان ته‌ختی ووتاردان ، ئه‌وه بوو حه‌مامه‌یه‌كی سوری له سه‌ر ئالاندبوو ، ده‌م چاوی خۆی یان روخساری خۆی داپۆشی بوو ، له سه‌ر مینبر (حجاج) ووتی :خه‌لك كۆ بكه‌نه‌وه ، خه‌لكی گومانیان كرد خۆی هاوه‌له‌كانی له كۆمه‌لی خه‌واریجه‌كانن ، ئه‌ویش له سه ر مینبر یان ته‌ختی ووتاردان چاوه‌ڕێ هاتنی خه‌لكی ده‌كرد ، ئه‌وه بوو خه‌لكه زانیان ئه‌وه ئینجا لیّ كۆ بوونه‌وه ، ئه‌و بێده‌نگ بوو ، وه بێده‌نگه‌یه‌كه‌ی زۆر درێژه كێشا ، پاشان (محمد ی كوری عومه‌یر ) ده‌ستی پر كرد له خۆل ویستی تێبگرێت ، ووتی: خوا بیكوژێت ، چونكه كه‌ر و قێزه‌ون و ناحه‌زه ، سوێند به‌خوا گومانم وایه هه‌واله‌كه‌ی یان ووتاره‌كه‌ی هاوشێوه‌ی روخساری بێت ، چونكه روخساری خۆی داپۆشی بوو ..؟! به‌لام كاتێك (حجاج ) ده‌ستی به قسه كردن كرد خۆله كه‌ی له‌ده‌ستی كه‌وته خواره‌وه ، نه‌ی ده‌زانی چ به‌لایه‌كی به سه‌ر دێت ..!!

لە دوایدا (حجاج) روخساری خۆی کردەوە یان ئاشکرای کردو دەستی بە ووتاردان کرد ووتی :

یا اهل العراق یا أهل الشقاق والنفاق ومساوی الاخلاق ...

انا ابن جلا وطلاع الثنایا ------------------ متی اضع العمامة تعرفوني

واتە: ئەی خەلکی عێراق ئەی ئەهلی دووبەرەکی دوو روویی بەد خوویی

من کوری بەرەبەیان و کەسێکم بەسەر بەرزی و نزماییەکاندا هەدەگەرێم .کاتێك عمامەکەم هەلگرم و روخسارم ئاشکرا بکەم بە باشی دەمناسن ..!!

سوێند بەخوا بە دوای ژیاندا دەگەرێم و لە شوێنی خۆی جێگیری دەکەم و بە یەکسانی و دادگەری سزاو پاداشت دەدەم ..!! بە باشی دەزانم هەندێ کەس پێگەیشتوە و کاتی دورینەوەی ئەوان نزیك بۆتەوە ..!! خوێن دەبینم لە سە عمامەکان تا سەر ریش دەستی بەبارین کردوە ..!!من بۆ رشتنی ئەو خوێنانە قۆلم هەلگرتووە ..!!

هذا اون الحرب فاشتدی زیم ------------------- قد لفها اللیل بسواق حطم

لیس یراعي أبل ولاغنم ------------------- و لا بجزار علی ظهر وضم

واتە: ئێستا کاتی جەنگ یان شەر هاتووە ، کەواتە بۆ جەنگ ئامادەبەن ، شەو لە ناو لۆق درێژێکدا کۆی کردۆتەوە کە هەر شتێك لە سەر رێگەی خۆی ببینێت ، پێشێلی دەکات ..!!نە لە وەرێنەوری ووشتر نە مەر و نە بکوژی قوربانیەکان لە سەر پێست یان قوماشێك کە گۆشت لە خاك دوور کاتەوە ..!! پاشان ووتی :

قد لفها اللیل بعصلبی ---------------------- اورع خراج من الدوی

مهاجر لیس بأعرابی

لیس اوان بکرة الخلاط --------------------- جاءت به والقلص الا علاط

تهوی هوی سابق الغطاط

واتە: شەو لە خۆیەوە ئالاندی و تەسلیمی پیاوێکی سەر سەختی کرد ، ئازایەکی جوان روخسار کە لەناو هاواری شەر گەران یان جەنگاوەران بە سەرفرازیەوە دێتە دەر ، کۆچکەری رێگەی خوایە ، وە بیابان گەر نیە ، لە کاتی جووت بوونی ووشتری گەنج لە ناو خەلکان یان گۆرەپانی ووشتری تیژپێی و بێ ناو نیشان نەهاتووە ، ئەو بۆ فراندی نێچیر وەك مەلی ئاگر خۆرە ، لە ناکاو لە ئاسمانەوە هێرش دەکات سەر زەوی ..!! ئینجا ووتی : بە خەلکی عێراق

سوێند بە خوا ئەی عێراقیەکان ، نە هاوشێوەی هەنجیر دەم گوشن نە وەك ترسنۆکەکان تەبل یان تەنەکەم بۆ لێدەدەن کە هەلبێم ..!! ئەوەی کردم ، بە پێی وشیاریەکی سەراسەری بوو ، چونکە من مەبەستی دوورترین نیشانەکانم کرد ..!! پاشان ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزی خوێندەوە ،قال تعالی: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا قَرۡيَةٗ كَانَتۡ ءَامِنَةٗ مُّطۡمَئِنَّةٗ يَأۡتِيهَا رِزۡقُهَا رَغَدٗا مِّن كُلِّ مَكَانٖ فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ١١٢﴾

[النَّحل : ١١٢] واتە : {بە سوپاس نەکردن نازو نیعمەتەکان لەناو دەچن} [ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُطْمَئِنَّةً ] خوای گەورە نموونەی شارێك ئەهێنێتەوە کە وتراوە: مەککە بووە یان مەدینە بووە یان شارێکی تر بووە کە هێمنی و ئارامی باڵی بەسەردا کێشاوە [ يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِنْ كُلِّ مَكَانٍ ] خوای گەورە ڕزق و ڕۆزیشی داون بە فراوانی و بە زۆری لە هەموو شوێنێکەوە [ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ ] بەڵام ئەوان کوفریان کرد بە نیعمەتی خوای گەورەو شوکرانەبژێری خوای گەورەیان نەکرد [ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ (١١٢) ] خوای گەورە توشی برسێتی و ترسی کردن بەهۆی کردەوە خراپەکانی خۆیانەوە..؟!

ئینجا ووتی : ئێوه ئه‌و خه‌لكانه‌ن هاوشێوه‌ی ئه‌و خه‌لكانه ، مه‌به‌ستی له ئایه‌ته‌كه بوو كه (خوای گه‌وره ) باسی ئه‌م خه‌لكانه ده‌كات ، پاشان ووتی : ئه‌میری باوه‌رداران (عبدالملك كوری مروان ) تیر هاوێژی خۆی كردووه ، وه تیره‌كانی خۆی تاقی كردۆته‌وه ، وه منی به به هێزترینیان ده‌ست نیشان كرد یان بینی ..! ! منی ره‌وانه كرد بۆ سه‌ر سینه و جه‌رگی ئێوه ، ئێوه خه‌لكانێكی سته‌مكار و خراپه‌كارو گه‌نده‌كارو فسادو ناسازگارو مونافق و دوو روو وه دوو ره‌نگ له كارو كردارن ..! ! دره‌نگانێكه به‌رێگه‌ی هه‌ل و چه‌وت به‌رێگه‌ی زیان ده‌رۆن و بناغه‌ی ئایینه گومراكانتان داناوه ..! ! بگه رێنه‌و بۆ سه‌ر یگه‌ی راست ..! ! سوێند به‌خوا ریسواتان زیلیل تان ده‌كه‌م ژه‌هرێكی تالتان ده‌رخوارد ده‌ده‌م تا له كاتی خویدا شیر بده‌ن ، ئێوه هاوشێوه‌ی دار له گه‌ل ئاگر سازگار تێكه‌ل ده‌كه‌م و وه‌ك دار در كاویه‌كان ده‌تانبرم تا ده‌سته‌مۆ ببن ..! ! یان هاوشێوه‌ی ووشتره یاخیه‌كان لغاوتان ده‌كه‌م كۆت زنجیرتان ده‌كه‌م ..! ! تا خراپه‌كاری و سه‌ركێشی له بیر بكه‌ن و یاخی گه‌ری پشت گوێ بخه‌ن ..! ! له ناو هاوه‌ن ده‌تان كوتم تاكو نه‌رم ببن ..! ! ئینجا ووتی : سوێند به‌خوا هیچ به لێنێك نادەم جگه له‌وه‌ی بتانگه‌رێنمه‌وه سه‌ر رێگه‌ی راست ..! ! وه هیچ ئه‌ندازه‌یه‌ك ناگرم تا چاكسازی له ناو ئێوه‌دا سه‌قامگیر بكه‌م ..! ! ووتی : من له دارو ده‌ستانه ئاسووده بكه‌ن ، هه‌ر كه‌سێك سوار ده‌بێت ، به ته‌نهای سوار بێت ده‌بێت ..! ! ئینجا ووتی: سوێند به‌خوا پاوه‌ش بۆ دادپه‌روه‌ری ده‌كه‌نه‌وه و له هێرش برده ده‌ست هه‌لناگرن ..! ! وه گفتو گۆ پشت گوێ ده‌خه‌ن تۆ ده‌لێت و ئه‌و ده‌لێت و فلان كه‌س له فیسار كه‌س ئه‌و داستانه بۆ من ده‌گێرێته‌وه ..! ! پشت گوێ ده‌خه‌ن وه‌گه‌ر نه بۆ هه‌ر پیاوێك له جه‌سته‌ی خوێدا ده‌بێته هۆكاری سه‌رقالی ..! ! ئێوه له كوێن و ئه‌وێ كوێیه ..؟! سوێند به‌خوا له سه‌ر راستی و دروستی سه‌قامگیر ده‌بن یا به شێوه‌یه‌ك شمشێر ده‌خه‌مه ناوتان كه ئافره‌تان بێ پیاو ده‌كه‌م..! ! منداله‌كانتان بێ باوك ده‌كه‌م ..! ! تاكو له خراپه‌كاری فسادی گه‌ندلی خۆتان به دوور بگرن ..! ! ئه گه‌ر كوناه بۆ گوناه كار ره‌وا ده‌بوو ، ئه‌وا باج كۆنه ده‌كرایه‌وه و هیچ دوژمنێك سه‌ر كه‌وتوو نه ده‌كرا و سنووره‌كان ده‌پچران ..! !ئینجا ووتی : ئه‌گه‌ر خه‌لكی به زۆری بۆ گۆره‌پانی جه‌نگ نه‌به‌ن ، ئه‌وه به ره‌زامه‌ندیه‌وه ئه‌و جه‌نگه ناكه‌ن..! !

ئینجا (حجاج ) به خەلکەکەی ووت : بیستوومه (موهەلیب ) تان له جەنگ جێهێشتووه ..؟! گوناهکارو خراپەکار بۆ شارەکەی خۆتان واته : شاری کوفا ، گەراونەتەوه ، سوێند بەخوا تاسیَ رۆژی تر که له سوپاکەی به دوور نابینم مەگەر ئەوەی خوێنی برێژم و مالەکەی وێران بکەم و سامانەکەی تالان بکەم ..!!

دواتر فەرمانیدا نامەکەی (عبدالملك کوری مروان ) بۆ خەلکی شاری کوفا خوێندەوه ..؟! کاتێك ووتی : دوای پارانەوه بۆ دەرگای (خوای گەوره ) ، سلاو له ئێوه ، سوپاس خوا دەکەم ..!! (حجاج ) ووتی : بیَ دەنگ به ئەو خەلکه شیاوی داردەستن ..!! ئەمیری باوەرداران سلاو له ئێوه دەکات خۆشەویستی پیرۆزیەکانی پەروەردگار له ئەمیری باوەرداران ..!! دواتر گەرایەوه مالەوه و هیچی تری بۆ ووتارەکەی زیاد نەکرد ..!!

بەلیَ کاتێك رۆژی سێیەم هات له شاری کوفا ، ئەوه بوو بانگی تکبیر له بازار بیسترا ، خەلکی رۆشتنه مەزگەوت ، ئەویش رۆشته مەزگەوت چوو لەسەر مینبر یان تەختی ووتار دان دانیشت ووتی : ئەی خەلکی عێراق ئه گەندەلکاران و خراپەکاران ، من تەکبیرم بیست بەلام نەك هاوشێوەی ئەو تەکبیرەی که بۆ رەزامەندی خوا بێت ، بەلکو ئێوه ئەی خەلکی عێراق له ترسان هێناتانه سەر زمان ..!! من ئێوه زۆر بەباشی دەناسم ، ئێوه خەلکانێکی نەزان و گێژن ، که بۆ بەربەرەلای و رابواردن دانیشتوون ..!! (حجاج ) ووتی : ئەی بەندەکانی دار دەست ، ئەی کورانی بێوەژنان ، ئایا کەسێك له ئێوه نیه کەمێك چاوەروان بێت ، بتوانن پارێزگاری له خوێنی خۆی بکات و جێگەی پێی خۆی بناسێتەوه ..؟! (حجاج ) ووتی : سوێند به خوا بریامدا بەلایەك بەسەر ئێوەدا بێنم بۆ رابردوو تان سزا بێت وه بۆ داهاتوودان ئامۆژگاری بێت ..!!

بەڵێ ئا لەم کاتەدا (عومەیر کوری زابی حەنزەلی تەمیمی ) هەستا و ووتی : خوا فەرمانداری ئێمە بپارێزێت ، من پاوێکی بە تەمەنم ، وە ئەم کورەی من گەنجە ..؟! (حجاج) ووتی : ئەمە باشترە لە باوکی خۆیەتی ..!! دواتر (حجاج) پرسی تۆ کێت ..؟!ئەویش ووتی : (عەمەیری کوری زابی ) (حجاج ) ووتی : ئایا ووتارەکەی دوێنی ئێمەت نەبیست ..؟! ئەویش ووتی : بەڵێ. (حجاج) ووتی : ئایا تۆ ئەو کەسە نیت جەنگ و شەرت دژی (عوسمانی کوری عەفان ) – خوا لێ رازی بێت – کرد ..؟! (عومەیر ) ووتی : بەڵێ. (حجاج ) ووتی : ئەی دوژمنی خوا ..!!بۆ لە جێگەی (عوسمانی کوری عەفان ) نەرۆیشتی ..!! (حجاج ) ووتی : ئایا چ شتێك بۆ ئەم کارە پالی پێوەنایت ..؟! (عومەیر ) ووتی : (عوسمانی کوری عەفان ) باوکمی خستە نێوە بەندیخانەوە چونکە پیاوێکی پیری بە تەمەن بوو ..!! ئینجا (حجاج ) ووتی : مەگەر تۆ نەبوویت کە ووتت:

هممت ولم أفعل و كنت وليتني ------------- تركت على عثمان تبكي حلائله

واتە: مەبەستی کارێکم کرد و نەمکرد . ئەوەندی نەمابوو ئەنجامی بدەم . خۆزگە عوسمانم بەشێوەیەك دەکوشت کە ژنان شین و رۆرۆی بۆ بکەن .!!

هەندێکی تریش رووداوەکە بەم شێوەیە دەگێرنەوە دەلێن : کە (عەنبەسی کوری سعید کوری عاص) بە (حجاج) ی ووت : ئایا ئەم پیاوە دەناسیت ..؟! (حجاج ) ووتی : نەخێر . ئەویش ووتی : ئەم پیاوە یەکێکە لە بکوژەکانی (عوسمانی کوری عەفان ) – خوا لێ رازی بێت – ئینجا دواتر (حجاج ) ووتی : ئەی دوژمنی خوا ..!! بۆ لە جێگەی ئەمیری باوەرداران (عوسمان کوری عەفان ) نە کوژاریت ..؟! دواتر فەرمانی کرد لە سەری بدرێت ، ئینجا ( عومەیر کوری زابی حەنزەلی تەمیمی ) کوشت ..!!

## فه‌رمانڕه‌وایه‌تی حه‌جاجی کوری یوسفی سه‌قه‌فی له شاری به‌صرا

به‌ڵێ هه‌ر له سالی (٧٥) کۆچیدا ، پاش ئه‌وه‌ی (حجاج) کاور باره‌کانی خۆی یه‌ك لایکرده‌وه پاش کوشتنی (عومه‌یر کوری زابی تمیمی ) ئه‌وه بوو به‌ره‌و شاری به‌صرا به‌ڕێکه‌وت ، له‌و کاته دا (عورو‌ه‌ی کوری موغیره‌ی کوری شه‌عبه‌ی ) له شاری کوفا له شوێنی خۆی ده‌ست نیشان کرد ، کاتێك چووه ناو شاری به‌صرا هاوشێوه‌ی شاری کوفا ده‌ستی به ووتاردان کرد ، خه‌لکی شاری به صرای ترساند ، (حجاج) به خه‌لکه‌که‌ی ووت : هه‌ر که سێك دوای سێ ڕۆژ که نه‌چێته نێو سوپاکه‌ی (موهه‌لیب ) ئه‌وا سزای ده‌دات ، چونکه ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : (حجاج) یه‌که‌م که‌س بووه خه‌لکی کوشتوه ئه‌وانه‌ی که له جه‌نگ هه‌لده‌هاتن یان نه‌ده‌چوونه شه‌ر و جه‌نگ کردن ..!! پیاوێك هه‌بوو له شاری به صرا به‌ناوی ( شه‌ریك کوری ئه‌عوه‌ری یه‌شکور) ڕۆشته لای (حجاج ) ئه‌و پیاوه نه‌خۆش بوو فیتقی هه‌بوو ، چاوێکی کوێر بوو به په‌ڕۆ چاوه کوێره‌که‌ی ده‌به‌ست ، هه‌ر له به‌ر ئه‌مه به (چاوبه‌مو ) بانگیان ده‌کرد ، که گه‌یشته لای (حجاج) پێ ووت : خوا فه‌رمانداره‌که‌ی ئێمه به هێز بکات ..!! ووتی : من فیتقم هه‌یه کاتێك (بشری کوری مروان ) والی به‌صرا بوو ، ئه‌و منی به‌خشی ، ئه‌مه به‌خششی منه و بۆ گه‌نجینه‌ی ده‌گه‌رێنمه‌وه ، له‌م کاته‌دا (حجاج ) فه‌رمانی کرد له سه‌ری بدرێت ، ئه‌و یان کوشت ، ئینجا (حجاج) به‌ره‌و گوندی رستق ئاوا به‌ڕێکه‌وت بۆ لای (موهه‌لیب ) له نێوان به‌صرا گونده‌که نزیکه‌ی هه‌ژده فه‌رسخ بوو ، (حجاج) به‌رده‌وام ده‌یویست پشتی (موهه‌لیب ) بۆ خۆی به هێز بکات ، ئه‌وه بوو له گونده‌که ووتارێکی پێشکه‌ش کرد ووتی : ئه‌ی خه‌لکی دوو شاره‌که ئێره ده‌بێته شوێنی ئێوه بۆ چه‌ندین سالٚ و چه‌ندین مانگ تا خوا دوژمنانی ئێوه له ناو ده‌بات ، دیسان ڕۆژێکی تر ووتاری دا ووتی : ئه‌وه‌ی (زیادی کوری زوبیر )به ئێوه‌ی ده‌به‌خشیٚ زیان به‌خشه چونکه پیاوێکی بیٚ ئایین و خراپه‌کاره ، ئێمه ئه‌م پیاوه به حه‌ق و ره‌وا نازانین ..!! به‌لام پێشتر (موصعه‌ب ) به‌خششه‌کانی هه‌ر که‌سێکی بۆ سه‌د درهه‌م زیاد کرد بوو ، ئه‌وه بوو (عبدالله کوری جارود ) هه‌ستاوه سه‌ر پیٚ ووتی: ئه‌م زیاد کردنه هی (کوری زوبیر ) نیه ..!! له لایه‌ن ئه‌میری باوه‌ڕداران (عبدالملك کوری مروان ) زیاد کراوه ..!! وه (بشری کوری مروان ) ئه‌نجامی داوه ..!! (حجاج) ووتی : تۆ بۆ قسه ده‌که‌یت ..؟! ئاگات له سه‌رت بێت ئه‌گه‌ر نا له لاشه‌ی جیاده‌که‌مه‌وه ..!! (عبدالله کوری جارود) ووتی : بۆ ..؟! من چاکه‌ی تۆم ده‌وێت و ئه‌مه قسه‌ی زۆرینه‌ی خه‌لکیه ..!!

پاشان (حجاج ) یەك مانگ ماوەی داو چاوەڕێ کرد ، باسی زیادە بەخشینەکەی نەکرد ، پاشان دووبارە ئەم باسەی وروژاندەوە ، دیسان (عبدالله کوری جارود ) وەکو جاری پێشو، قسەکانی هێنایەوە سەر زمانی ..!! (مەصقەلە کوری کەربی عەبدی ) کە (باوکی روقبە کوری مەصقەلە ) کە ئەو پیاوە فەرموودەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕنەوە ..!! هەستا ووتی : ئەی کۆمەلانی خەلك کە کۆیلە رێبەرن ، شیاو نیە ووتاری شوانەکەی خۆیان بۆ بگەرێننەوە ..!! ئەوەی فەرماندار ووتی : بیستمان و فەرمان دەبەین چ بمانەوێت چ نەمانەوێت ..!! پاشان (عبدالله کوری جارود ) ووتی : ئەی کوری ژنی جەرمەقانی ..!! تۆ کارت بەمە چیە ..؟! لە کەیەوە کەسێکی وەك تۆ شیاوە لەم شوێنە دا قسە بکات ..!! ئینجا دەستەیەکی تریش لە گەورەکان روویان لە (عبدالله کوری جارود ) کرد ، قسەکانی ئەویان بەراست زانی ، کە ئەمانەبوون : (هوزەیل کوری عومرانی بورجەمی ) و (عبدالله کوری حەکیم کوری زیادی موجاشعی ) کەسانیتریش پشتیان گرتن ، ئەمانە ووتیان : بە (عبدالله کوری جارود ) ئێمە لە گەل تۆین ، ئەم پیاوە دەست هەلناگرێت ، و تالەم زیادەیە کەم بکاتەوە ، واتە : مەبەستیان لە (حجاجی کوری یوسفی سەقەف ) بوو ، ئینجا ووتیان : با لەگەل تۆ بەیعەت بکەیت بۆ ئەوەی (حجاج) لە ولاتی عێراق دەربپەرێنین ، وە نامەی بۆ ئەمیری باوەرداران (عبدالملك کوری مروان ) بنووسین ، وە داوای لێ بکەین پیاوێکی تر وەك فەرمانداری شاری بەصرا بۆ ئێمە دەست نیشان بکات ، بەلام ئەگەر زاری نەبوو (عبدالملك کوری مروان ) ئەوا (حجاج) لە سەر فەرمانداریەکی لادەبەین ، چونکە تا ئەو کاتە خواریجەکان بوونیان هەیە و ، وە لە ئێمە دەترسێت ..!! ئەوە بوو خەلکی زۆر بە نهێنی بەیعەتیان لە گەل ئەم دەستەیە بەست ، وە سوێند و پەیمانیان لە گەل یەکتری وەرگرت ..!! ئینجا پاشان (حجاج) بەم کارە نهێنیەی زانی ئەویان لێ ئاگادار کردەوە ، پاشان زانی ئەوان لە سەر چ کارێك رێکەوتووت ..!! ئینجا (حجاج ) گەنجینەی پاراست ئەمە لە مانگی ربیع دووەمی سالی (٧٦) کۆچیدا بوو ، بەرانبەر سالی (٦٩٥) زاینی دا ، ئەوە بوو راپەرینە دەستی پێکرد ، (عبدالله کوری جارود ) خەلکی (عبدالقیس ) لە ژێر ئالاکەیان کۆ کردەوە ..!!

## حجاجی کوری یوسفی سەقەفی دەبێتە فەرمانرەوای شاری مککە

بەلێ شتێکی شروشتی بووە کە (حجاج) دەبێتە فەرمانرەوایەتی شاری مککە بگرێتە دەست پاش کوشتنی (کوری زوبیر ) سەرکەوتنی بەسەریدا پاشان لە ناو بردنی (کوری زوبیر ) کە ئەو کاتە خەلیفەی شەرعی موسلمانان بوو لە شاری مککە ، وەك لە پێش دا باسمان کرد ، ئەوە بوو (حجاج) بەیعەتی وەرگرت لە خەلکی مککە بۆ (عبدالملك کوری مروان ) دوایی کوژرانی (کوری زوبیر ) ، بەلام دەگێرنەوەی (عبدالملك کوری مروان ) بە زۆری و زەبری (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) خۆی کردە خەلیفەی موسلمانان ، بەزەبری هێز و چەك و ترس و ستەمی (حجاج) پاش کوژرانی (کوری زوبیر )ئەوە بوو (حجاج) لە سالی (٧٤) کوچیدا، والی شاری مەدینەی کە (تاریقی کوری عمر ) بوو لە سەر کارەکەی لابرد ، کە (تاریق کوری عمر ) یەکێك بوو لە فەرماندانەی کە بەشداری سەرکەوتنەکەی (حجاج) کرد بەرانبەر بە (کوری زوبیر ) ، بەلام کاتێك سەری (کوری زوبیر )یان هێنا بۆ (حجاج ) ، ئەوە بوو (تاریق کوری عمر ) ستایشی (کوری زوبیر)ی کرد ووتی : ژنان لە مە پیاو ترو مەردترو تەقوادار تریان نەهێناوەتە دونیا، مەبەستی پیاوێکی زۆر تەقوادارو شاهامەتان کوشتووە ..!! پاشان (حجاج ) ووتی : ئایا ستایشی کەسێك دەکەیت کە دژی ئەمیری باوەرداران بووە ..؟! ئەویش ووتی : بەلێ . ئێمە بۆ ماوەی حەوت مانگ گەمارۆی (کوری زوبیر) مانداوە ، بەلام ئەو بەبێ هیچ سەربازێك و قەلایەك و بەر بەستێك ، بەلام لە ئێمە بە هێز ترو تۆلە سێنتر بوو بوو ، بەلام ئەم قسانەی (تاریق کوری عمر ) گەیشتە لای (عبدالملك کوری مروان ) ئەو ووتەکانی بەراست دانا ..!!

دەگێرنەوە دەلێن : (تاریق کوری عمر ) لە سالی (٧٣) کۆچیدا بە فەرمانی (عبدالملك کوری مروان) بۆ ماوەی پێنچ مانگ فەرمانرەوایی شاری مەدینە بووە ، بەلام دواتر (عبدالملك کوری مروان ) هەر خۆشی لە سەر کارەکەی لابرد ، فەرمانرەوایەتی شاری مەدینەی دایە دەستی (حجاجی کوری سویفی سەقەفی ) ..!!

بەڵێ فەرمانرەوایەتی (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) لە شاری مککە و مەدینە دا ، بە دژواترو خراپترو نەهامەترین قۆناغ و سەردەمدا تێپەری کە خەلکی بە چاوی خۆیان بینیان کە چەند ستەمکارو زالم بووە ، چونکە (حجاج) هیچ رێزو شکۆی بۆ ئەو هاوەلانەی پێغەمبەری خوا ﷺ دانە دەنا کە لە ژیاندا مابوون ، وەکو ئەم هاوەلانە (جابری کوری عبدالله ) و (ئەنسی کوری مالك ) و (سەهلی کوری سعد ) – خوا لێیان رازی بێت – ، یەکێك لەو سووکایەتیانەی کە (حجاج ) بە هاوەلانی پێغەمبەر ﷺ کردووە ، ئەوەی کە زانایان دەگێرنەوە کتابی (البدایە والنهایە ) ابن کسیر و (کامل تاریخ ) ابن جریر تەبری باسیان کردووە ، کە هۆکارەکەشی ئەمەبووە دەلێن : (حجاج ) جنێوی داوە بەم دوو هاوەلە (جابری کوری عبدالله ) و (سەهلی کوری سعد ) گویا ئەم دووانە پشتیوانی خەلیفەی موسلمانان (عوسمانی کوری عەفان ) نەبوو بوون ..؟! هەر وەك بە شێوەیەکی زۆر نەشیاو مامەلەی لە گەل کردوون مۆری داوە لە گەردەنیان بۆ سووك کردنیان..؟!

لە (محمدی کوری عمران ) دەگێرێتەوە باس لەم رووداوە دەکات دەلێت : من (جابری کوری عبدالله ) بینی دەستی مۆر کرا بوو ..؟! هەروەها (ئەنسی کوری مالك ) بینیوە گەردنی مۆر کرا بوو ..؟!

بەڵێ (حجاج ) خوا سزایی بدات ، بەم کارەی دەیوست هاوەلان سووك بکات ، فەرمانرەوایی (حجاج) لە شاری مککە و مەدینەدا ، بەراستی زۆر ستەمکارانە بوو ، بە تایبەتی بەرانبەر ئەو هاوەلانەی کە لە ژیاندا مابوون ، زۆر بە خراپی مامەلەی لە گەل دەکردن و سزایی دەدان گوفتاری ناشرینی بەرانبەر دەکردن ، تەنها بۆ ئەوەی زولم ستەمی خۆی زال بکات بەسەر ناوچەکە یان جەخت لە فەرمانرەوایەکەی بکاتەوە یان دلێ (عبدالملك کوری مروان ) لە خۆی رازی بکات ..؟!

## ڕاپەڕاینی (عبدالله کوری جارود )لە دژی (حەجاجی کوری یوسفی سەقەفی)

پاش ئەوەی (حجاج) ولاتی عێراقی بەجێهیشت و بەرێکەوت بۆ شاری بەصرا ، ووتارێکی دا وەکو ئەو ووتارەی لە شاری کوفا کردی ، وە پیاوێکی هێنا لە (بنی شوکر ) کوشتی ووتی : ئەم پیاوە سەرپێچی کردووە ..! ! بەلام کوشتنی ئەم پیاوە خەلکی بەصرای ترساند و رەقیان لێ هەلگرت، وەك بەر هەلستکار لە (حجاج) راپەرین ، ئەوە بوو لە (رامهرمز) کۆبوونەوە ..؟!

بەلێ یەکەم بزوتنەوەی بوو کە روو بەرووی (حجاج) بوونەوە ئەوەش بە یەکەم راپەرین دەژی (حجاج ) دادەنریت ، کە ئەویش (عبدالله کوری جارود سەرۆکایەتی ئەم راپەرینەی دەکرد ، ئەوە بوو ووتاری دا

(حجاج) ووتی : ئەو زیادەی کە (کوری زوبیر ) بە ئێوە دەبەخشێ ، زیان بەخشە خراپە ، چونکە پیاوێکی بێ تەقواو بێ دین و خراپە کار ئەنجامی داوە ، ئێمە بەرەوا یان بە حەقی نازانین ..؟!

(عبدالله کوری جارود) هەستاوە سەر پێ و ووتی : ئەم زیاد کردنە ، هی (کوری زوبیر ) نیە ، لە لای ئەمیری باوەرداران (عبدالملك کوری مروان ) زیاد کراوە ، وە ئەم زیادکرانەش دراوەتە بە (بشیری کوری مروان ) کە برای (عبدالملك کوری مروان ) پێشتر والی بەصرا بووە ..! !

پاشان (حجاج) لە ووتاردانەکەی دابەزی بۆ ماوەی یەك مانگ باسی زیاد بەخشینەکەی نەکرد.

دووبارە ووتاری دایەوە ئەم باسەی ورووژاندەوە باسی کردەوە ، بۆ ئەوەی ئەم زیاد بەخشینە نەهێلێت بۆ خەلکی بەصرا ئەوەی ئەم زیاد بەخشینە وەردەگرن لێیان قەدەغە بکات بی برێت.!

پاشان دوو بارە (عبدالله کوری جارود ) ئەم باسەی هێنایەوە سەر زمانی ، ئینجا پیاوێك کە ناوی (مەصقەلە کوری کەربی عبدی ) هەستایەوە ووتی : ئەی کۆمەلانی خەلك کە کۆیلەی رێبەرت ، شیاو نیە ووتاری شوانەکەی خۆیان بۆ ئەو بگەرێننەوە ، ئەوەی فەرماندداری ووتی ، مەبەست پێی (حجاج) بوو ، ئەوا بیستمان و فەرمان دەبەین چ بمانەوێت چ نە مانەوێت ..؟!

(عبدالله کوری جارود ) بە (مەصقەلە کوری کەربی عبدی ) ووت : ئەی کوری ژنی جەرمەقانی، مەبەستی پێ سەرزەنشت کردنی بوو ، ووتی : تۆ کارت بەم کارانە چیە ..؟! ووتی : لە کەیەوە کەسێکی وەك تۆ شیاوە لەم شوێنانەدا قسە بکات ..! !

ئینجا هەندێك له گەورەو پیاوەكانی شاری بەصرا روویان له (عبدالله كوری جارود ) كرد ، ووتەكانی ئەو یان پشت راست كردوه، وه پال پشتیان له قسەكانی كرد ، كه ئەم پیاوانه بوون : (هوزیل كوری عمرانی بورجمی ) و (عبدالله كوری حەكیم كوری زیادی موجاشعی ) و له گەل ئەمانه كەسانی تریش چوونه بەرەی (عبدالله كوری جارود ) بزوتنەوەی راپەرینیان پێك هێنا ، هەر هەموو ووتیان : ئێمه لەگەل تۆ داین و هاوڕێ هاوبەشی تۆین له هەر كارێك و راپەرینێك كەئەنجامی دەدی ..؟! ووتیان : چونكه ئەم پیاوه دەست هەلناگری تا ئەم زیادەیه كەم بكاتەوه ، وەیان دەست هەلناگری له ستەمكاری و خراپەكاری ، ئەم پیاوه مەبەستیان له (حجاجی كوری یوسفی سەقەفی )بوو ..؟! ئینجا هەر هەموویان بەیعەتیان بەست له گەل یەكتری نیازی ئەوەیان بوو كه له ولاتی عێراق (حجاج ) دەرپەرێنن ، وه نامەش بۆ (عبدالملك كوری مروان ) بنووسن ، داوای لێ بكەن كه فەرماندەیەكی تر له جێگای (حجاج ) دابنێ ، وەك فەرمانداریەتی دەست نیشان بكات ، بەلام ووتیان : ئەگەر (عبدالملك كوری مروان ) رازی نەبوو ، ئەوا به خۆیان دەرپیەرێن و راپەرینی له دژی بەرپا بكەن و له سەر فەرمانداریەتی ولاتی عێراق لای ببەن ..! ! هۆ كارەكەشیان بۆ ئەمه گەراندەوه ، ووتیان : چونكه تا ئەو كاتەی خواریجەكان بوونیان هەیه ، ئەمه دەرفتێكی گونجاوه بۆ راپەرین و دەرپەراندنی (حجاجی كوری یوسفی سەقەفی ) ئەو كاته (حجاج ) له ئێمه ده ترسێت ..؟!

ئەوه بوو خەلكی به نهێنی بەیعەتیان له گەل (عبدالله كوری جارود ) كرد و سوێند و پەیمانیاندا ، وه له گەل یەكتری پەیمانیان وەر گرت ..! !

ئەوه بوو (جحاج كوری یوسفی سەقەی ) ئاگادار كرایەوه ، وه هەوالەكەی پێ راگەیاندرا ، كه به سەرۆكایەتی (عبدالله كوری جارود راپەرین له دژی ئەو بەرپا دەكەن ، ئەوەشی زانی خەلكانێكی زۆر پەیوەندیان بەستووه وه پەیمانیان له گەل یەكتری وەر گرتووه وه بەیعەتیان ( عبدالله كوری جارود ) داوه ، ئەم رووداوه ش له سالی (٧٦) كۆچیدا روویدا ، بەرانبەر سالی (٦٩٥) زاینی بووه ..؟!

به‌ڵێ (عبدالله کوری جارود ) ئه‌وه بوو خه‌ڵکانی (عبدالقیس ) له ژێر ئالاکانیان کۆ کرده‌وه ، خه‌ڵکی له ماله کانیان رۆیشته ده‌روه ، بۆ ئه‌وه‌ی (حجاج) ده‌رپه‌رێنن ، ئه‌وه بوو (حجاج) به ته‌نها مایه‌وه ، جگه له که‌سانی نزیکی خۆی و بنه‌ماڵه‌که‌ی خۆی ، ئیتر که‌س له ده‌وری نه‌مایه‌وه ، ئه‌وه بوو پێش نیوه‌رۆ رۆیشتنه لای (حجاج) ، ئه‌م رۆژه بوو که (عبدالله کوری جارود ) هاوه‌ڵه‌کانی زه‌نگی راپه‌رینیان لێدا په‌رده‌که‌یان پچراند ، به‌ڵام ئه‌م رۆژه گه‌نجینه‌که‌ی (حجاج) و که‌ره‌سته‌کانی جه‌نگ له پشته‌وه بوو ، (حجاج) پیاوێکی نارد به ناوی ( ئه‌عیه‌نی ) بۆ لای (عبدالله کوری جارود ) ، په‌یامی پێ راگه‌یاند که فه‌رمانره‌وایی به‌صرا داوای تۆ ده‌کات ، به‌ڵام (عبداللەکوری جارود ) ووتی : فه‌رمانره‌وا کێیه ..؟! نا هیچ به خێر هاتنێك شیاوی ( کوری ره‌غاڵ) نیه ..!!

(عبدالله کوری جارود ) ووتی: ده‌بێت ئه‌و به‌دبه‌خت ژێرکه‌وتووه له ناو ئێمه‌دا بروات ، ئه‌گه‌ر نا جه‌نگی له گه‌ڵدا به‌ر پا ده‌که‌ین یان شه‌ری له گه‌ڵ ده‌ست پێ ده‌که‌ین ..؟!

(ئه‌عیه‌ن) ووتی :(حجاج) ده‌ڵێت : ئایا تۆ شادومان ده‌بیت له گه‌ڵ خزم و هاورێکانت دا بکوژرێت ..؟! سوێند به‌و که‌سه‌ی که گیانم له ده‌ستی ئه‌و دایه ، ئه‌گه‌ر نه‌یێت خه‌ڵکه‌که‌ت به گشتی و خزم و بنه‌ماڵه‌که‌ت به تایبه‌تی ، ده‌که‌مه په‌ندو وانه‌یه‌ك بۆ داهاتوو ..؟! به‌ڵێ (حجاج ) ئه‌م په‌یامه‌ی به (ئه‌عیه‌نه ) ناردبوو بۆ (عبدالله کوری جارود ) ..!!

(عبدالله کوری جارود)یش به (ئه‌عیه‌نه ) ووت : ئه‌گه‌ر نێردراو نه ده‌بوویت ، ده‌م کوشتی ، ئه‌ی زادی ژنی خراپه‌کار ..؟! ئینجا فه‌رمانی دا به‌خه‌ڵکه‌که ئه‌و نێدراوه‌یان به شێوه‌یه‌کی خراپ ده‌رکرد ..!! پاشان خه‌ڵکی له ده‌وری (عبداللەکوری جارود ) کۆبوونه‌وه ، ئه‌ویش له‌گه‌ڵ خه‌ڵکه‌که به‌ره‌و لای (حجاج کوری یوسفی سه‌قه‌فی ) به‌رێکه‌وت ، مه‌به‌ستیان راپه‌رین و ده‌رپه‌رینی (حجاج ) بوو ، کاتێك له شوێنی مانه‌وه‌ی (حجاج ) نزیك بوونه‌وه ، خێوه‌تگه‌ی ئه‌ویان تاڵان کرد ، هه‌تا توانیان مه‌رو ماڵات و شت ومه‌کی ئه‌ویان به تاڵان برد ، خه‌ڵکی (یه‌مان ) هاتن و هاوسه‌ره‌که‌ی یان برد که (کچی نه‌عمان کوری به‌شیری ئه‌نصاری ) بوو ، له‌و لاشه‌وه (موزه‌ره‌یه‌کان ) هاتن و هاوسه‌رێکتری ئه‌ویان برد ، واته : (دایکی سلمه‌ی کچی عبدالرحمن کوری عمرو ) که‌برای (سوهیل کوری عمرو ) بوو ..؟!

بەڵێ ئەوە بوو لەم ڕۆژەدا فەرمانڕەوایی بەصرا کە (حجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی )بوو ، بەدیل کەوتە دەستی بزوتنەوەی ڕاپەڕینی بەصرا بە سەرۆکایەتی (عبدالله کوڕی جارود) خەڵکی ئەویان بەدیك گرت ، باشان خەڵکە کە ترسان ، دواتر (حجاج) یان ئازاد کرد ، دوتریش بلاوەیان لێکرد.

(غەزبانی کوڕی قوبعەسەر ) بە (عبدالله کوڕی جارود )ی ووت : پێش ئەوەی بەرخ بەسەر تۆ دا نانی نیوەڕۆدا بخوات .! لە پێش ئەو نانی نیوەڕۆ بخۆ ..؟! نابینی دەستەیەکی زۆر لە خەلکەکەی تۆ پێویستی ئەو بوون ..؟! مەبەستی (حجاج ) بوو ..!!

(غەزبان) ووتی : ئەگەر بەیانی بێت ، هاوەڵەکانی زۆر دەبن مەبەستی (حجاج ) بوو ، وەهاوەڵەکانی تۆش کەم دەبن ..؟!

(عبدالله کوڕی جارود ) ووتی : ئێوارە نزیك بۆتەوە ، بەرەبەیانی زوو هێرش دەکەینە سەری..!!

دوو فەرماندەی بەصرا لەگەل (حجاج ) بوون ، (عوسمانی کوڕی قەتەن حارسی ) و (زیاد کوڕی عمرو عەتکی ) ئەوە بوو (زیاد ) فەرماندەی پاسەوانەکانی شاری بە صرا بوو ..!!

(حجاج) بەم دوو فەرماندەیەی ووت : ئێوە چی دەبینن ..؟!

(زیاد) ووتی : بۆ چوونی من وایە لەم خەلکە بۆ تۆ ئەمان وەر بگرم ، وە تۆ بڕۆیت لای ئەمیری باوەڕداران (عبدالملك کوڕی مروان ) چونکە خەلك لە دەوری تۆ بلاوەیان کردووە ، مەبەستی ئەوە بوو کە (حجاج ) کەسی لە گەل نەماوە جگە لە خزم و کەس و کاری نەبێت ..!!

(زیاد) ووتی : من بە باشی نازانم بەم سوپاکەمەی کە لە دەوری تۆیە ، ڕوو بەڕووی ئەم سوپاگەورەیەی (عبداللەی کوڕی جارود ) خەلکەکەی ببیەوە ..؟!

(عوسمانی کوری قەتەنی حارسی ) بە (حجاج ) ی ووت : بەلام ئەمە بۆ چوونی من نیە ..؟!
چونکە ئەمیری باوەرداران (عبدالملك کوری مروان ) تۆی لە کارەکەیدا کردۆتە هاوبەش ، تێکەلاوی کردی ، تۆی کردە راوێژ کاری خۆی و تۆی بەسەر کاروبارەکاندا زال کرد ، تۆ هێرشت کردە سەر (کوری زوبێر ) لە هەموو خەلکی بەرێز ترو مردتر بوو ..! ! پاشان ئەوت کوشت ..! !
وە ئەمیری باوەرداران پاداشتی شیاوی پێ بەخشیت ، ئەمیری باوەر داران تۆی کردە فەرمانرەوایەتی ولاتی حیجاز واتە : شاری مککەو مەدینە ..! ! دواتریش تۆی وەك فرمانرەوایەیی شاری کوفاو بەصرا دەستنیشان کرد .! ! ئێستاش کەش بەروەو ئاوات و ئارەزووەکانت دەرۆیت و گەیشتویتە مەبەستی خۆت ..! ! وە سواری ووشترێك دەبیت بەرەو لای ئەمیری باوەرداران (عبدالملك کوری مروان ) دەگەرێتەوە ، واتە: سواری ووشترێ دەبی بەرەو شام کۆچ دەکەیت. ! !

ووتی : سوێند بەخوا ئەگەر ئەو کارە بکەیت ، نە لە لای (عبدالملك کوری مروان ) شوێن و پێگەو پایەیی ئێستات دەمێنێت ، نە خۆت لە ریسوا بوون و فەوتان دەپارێزیت ..؟!

(عوسمانی کوری قەتەنی حارسی ) ووتی : ئەمە بۆ چوونی منە ... مەبەستی رانەکات شەر بکات تاکو دەمرێت ، واتە: ووتی : شمشێرەکان بە دەستەوە بگرین و بەیارمەتی ئازایەتی تۆ شەر جەنگی ئەوان بکەین تاکو سەر دەکەوین یان بە سەر بەرزانە بمرین ..؟!

(حجاج) ووتی : بۆچوونی راست ئەوەیە ..! ! ئەوە بوو (حجاج ) ئەم ئامۆژگاریەی (عوسمانی کور قەتەنی ) لە بیر نەکرد ، بەلام بۆچوونەکەی ( زیادی کوری عمری ) لە دلّ هەلگرت ..! !

(عامل کوری میسع ) هاتە لای (حجاج) ووتی : بۆ تۆ لە خەلکان ئەمانم وەر گرتووە ..؟!

(حجاج) بەشێوەیە وەلامی دایەوە کە دەنگی خۆی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی خەلکی گوێ بیستیبن،

(حجاج) ووتی : سوێند بەخوا ئەمانیان پێ نادەم تاکو (هوزیل کوری حەکیم ) بهێنە لای من .!
ئەویش کەسێکی بۆ لای (عبیدەی کوری کەعبی نمیری ) رەوانە کرد و پەیامیدا ، کە بۆ لای من وەر بمپارێزرە ..! !ئەویش وەلامی دایەوە ووتی : ئەگەر بێتە لای من دەتپارێزم ..! !

(حجاج) ووتی : ئەمانی تۆم ناوێت و وە رێزت لێ ناگرم ..! !




ئەوە بوو کەسێکی تریشی بۆ لای (محمدی عومەیری کوری عوتارد ) رەوانەکرد ئەویش هەمان داواکری لە گەلدا باس کرد و هەمان وەلامی بیت ..!!

پاشان کەسێکی تریش بۆ لای (عبدالله کوری حەکیمی موجاشعی ) رەوانە کرد ئەویش بە هەمان شێوە یەکەم هەمان وەلامی هەبوو بۆ (حجاج) ی گەراندەوە..!!

ئەوە بوو (عبدالله کوری حوصەین ) بە لای ئەم پیاوانە تێپەری وەك : (عبدالله کوری جارود ) و (عبدالله کوری حەکیم ) چەند کەسێکی تریش لە سووچێکدا وەستابوون ، وە بە نهێنی لە گەل یەك قسەیان دەکرد ، ئەویش بەوانی ووت : ئێمە گفتووگۆکەی خۆتان ئاگادار بکەنەوە ، ئەوانیش ووتیان : دووربە کەس لە (نەوەی حەبت ) نابێتە هاوبەشی گوفتووگۆکانی ئێمە ..!!

بەلیٚ ئەم پیاوە کە (عبدلله کوری حوصەین) بوو لەم پیاوانە توورە بوو ، ئەویش یەکسەر لە گەل سەد پیاوی شەر کەر چوو پال پشتی یان پێوستی (حجاج کوری یوسفی سەقەفی ) کرد ..؟!

(حجاج) ووتی : بە ( عبدلله کوری حوصەین ) دوای هاتنی تۆ ترسم نیە ..!!

ئەوە بوو (قتیبە کوری مسلم ) لە ناو خەلکەکەی لە (یحیی ئەعصر ) کەوتە جموجۆل و ووتی : سوێند بەخوا رێگە نادەم (حجاج) بکوژن یان سامانەکەی بە تالان ببەن ..!!ئەویش پال پشتی لە (حجاج) کردوو هاتە ریزی هاوەلانی (حجاج)ە وە ..!!

بەلیٚ (حجاج ) لە ژیاندا بیٚ هیوا ببوو، ئەو کەسانە هاتن ئارامی ئۆقەریان بۆ گەراندەوە ، چونکە هیچ هیوایەکی نەمابوو جگە لە مردن و جەنگ کردنێکی زۆر دژوار تووشی (حجاج ) هاتبوو ..!!

دواتریش دەستەیەکی تریش هاتنە رێزی (حجاج ) کە ئەمانە بوون : (کوری علی کلابی ) و (سعید کوری ئەسلم کوری زورعە ) هاتنە رێزی سوپاکەی (حجاج) وە (جعفەری کوری میسمەع کوری مالك ) ئەویش پەیامی بۆ نارد ئەگەر دەتوێت پێویستی تۆ دەبم ئەگەر بخوازی دەمێنمەوە ، وە خەلکی لە جەنگ و شەر کردن دوورەکەمەوە ..؟!

(حجاج) وەلامی دایەوە ئەم کارە بکە ..؟!

به‌لیّ کاتیّك خه‌لکه که له لای (حجاج ) کۆبوونه‌وه که به‌و خه‌لکه‌ی ده‌روبه‌ری ده‌یتوانی پاریّگاری له خۆی بکات ، له پاشان هاته ده‌روه سوپاکه‌ی خۆی ریّکخست ، ئه‌وه بوو خه‌لکی به‌رده‌وام پیّویستی بوون ، به‌لام کاتیّك به‌ره‌به‌یان بوویه‌وه بینی شه‌ش هه‌زار جه‌نگاوه‌ری شه‌رکه‌ری له ده‌ورو به‌ری کۆبوونه‌ته‌وه ..!

! ده‌گیّرنه‌وه ده‌لیّن : (عبیدالله کوری زیاد کوری زه‌بیان ) ووتی : بۆ چوونی تۆ چیه ..؟!

ووتی : بۆ چوونی راستت بشت گویّ خست که (غه‌زبان) بیری خستیته‌وه ، پیّش ئه‌وه‌ی به‌رخ له‌سه‌ر تۆ نانی نیوه‌رۆ بخوات ، نانی ئیّواره بخۆ ..؟!

ووتی : ئیّستاش ته‌نها خۆراگری به‌رده‌وام بوون ماوه‌ته‌وه ..؟!

ئه‌وه بوو (عبدالله کوری جارود ) داوای درعیّکی سه‌ربازی کرد به پیّچه‌وانه‌وه له به‌ری کرد و ئه‌مه‌ی به‌خراپ لیّکدایه‌وه ..!!

(حجاج ) سه‌ر بازان و هاوه‌له‌کانی خۆی بۆ شه‌ر یان جه‌نگ کردن هاندا ووتی : زۆری و بۆری ئه‌وان نه‌بیّته هۆی ترسی ئیّوه ..؟!

ئه‌وه بوو شه‌ر به‌ر پا بوو خه‌لکی روو به‌رووی یه‌کتری بوونه‌وه ..!!

فه‌رمانده‌ی بالی راستی سوپاکه‌ی (عبدالله کوری جارود ) ئه‌وه بوو (هوزیل کوری عیمران ) بوو ، وه فه‌رمانده‌ی بالی چه‌پ (عبیدالله کوری زیاد کوری زه‌بیان ) ..!!

وه فه‌رمانده‌ی بالی راستی سوپاکه‌ی (حجاج ) ئه‌وه بوو (قوتیبه‌ی کوری مسلم ) بوو یان ( عبادی کوری حوصین ) ، وه فه‌رمانده‌ی بالی چه‌پی (سعید کوری ئه‌سلم ) بوو ..!!

بەلێ شەر دەستی پێکرد (عبدالله کوری جارود ) لە گەل سوپاکەی خۆی هێرشی کردەست پێکرد تاکو سوپاکەی (حجاج) بە جێهێشت ..!! پاشان (حجاج ) گەرایەوە هێرشی کردە سەر ، دەگێرنەوە دەلێن : شەر کە نزیکەی کات ژمێرێکی خەیاند ، چونکە ئەوەند نەمابوو سوپاکەی (عبداللەکوری جارود ) سەر کەوتن بە دەست بێنن ..؟! بە لام لە ناکاو لە ناو شەر کە تیرێکی نەناسراو هات و بە (عبداللەی کوری جارود ) کەوت و کوژار ..!!

ئەوە بوو جارچیەکەی (حجاج) چاری دان هاواری کرد ووتی : ئە خەلکێنە ئەمان بۆ ئێوە پێشنیار کردووە ، جگە لە (هوزیل کوری عیمران ) و ( عبدالله کوری حەکیم ) ..!!

دوا تریش (حجاج ) فەرمانیدا کە شوێن هەلهاتووەکان نەکەون ..!! ووتی : شوێن کەو تنی خەلکی ئەمە کارێکی نەشیاو ناپەسەندە ..؟!

ئەوە بوو (عبیدالله کوری زیاد کوری زەبیان ) شکستی خوارد هەلهات ..؟! بەلام ئەو رۆیشتنەی (عبیدالله کوری زیاد کوری زەبیان ) چووە بۆ لای ( سعید ی کوری عەیاز کوری جولەند ئەزدی ) خەلکی بە (سعیدی کوری عەیاز) یان ووت : کە (عبیدالله کوری زیاد کوری زەبیان ) ئەو پیاوێکی خوێن رێژە ، وە خۆتی لێ بەدور بگرە ..؟!

دەگێرنەوە دەلێن : کاتێك گەندۆرەی یان کالەك بێگەیشت تازە هاتە بازارەوە ، ئەوە بوو (سعید کوری عەیاز ) گندۆرەیەکی یان کالەکێکی کری ، نیوەی خوارد نێوەکەی تریشی ژەهراوی کرد ناردی بۆ (عبیدالله کوری زیاد کوری زەبیان ) ئەویش خواردی و هەستی بە ئازارو زیانەکەی کرد، ووتی : دەمویست من ئەو بکوژم بەلام ئەو دەستی پێش خست و منی کوشت ..؟!

بەلێ سەری (عبدالله کوری جارود ) وە لەگەل هەژدە کەس لە گەورەکانی کوفا یان بۆ لای (موهلیب ) رەوانەکرد ئەوانیان بەسەری رمەکانەوە کردبوو ، بۆ ئەوەی خەواریجەکان ببینن ، پەند وعبیرەت وەر بگرن ، دلّ یان بە دژایەتی (حجاج) و ئەمیری باوەرداران و دەولەتی ئەمەوی خۆش نەکەن ، چونکە دژایەتی کردن رووبە روو بوونەوەی دەولەتی ئەمەویەکان ئەمە سەر ئەنجامیانە چارەنووسی هەرکەسی بەم ئامانەجە دەروات کە (عبداللەکوری جارود ) هاورێ کانی وەریان گرت ..؟!

## راپەرینی (شێرى زەنگی یان ریاح شێر زەنگی ) لە دژی (حجاج )

بەلێ دەگێرنەو دەلێن : (زەنگیە کان یان زەنجەیان ) ئەو کۆمەلە خەلکانە بوون ، لە قارەی ئەفریقاوە هێنرا بوونە شاری بەصرا ، لە لایەن بازرگانەکانی کۆیلە فرۆشەوە لە شاری بەصرا بە کویلە فرۆشرا بوون ، ئەمەنە کاری قورس گرانیان پێدەکرا ، وەك هەلکەندنی بیرو زەوی کێلان ئیش کاری کوشتوکالی کردن ، وە لە کانە کانی خوێ کاریان دەکرد لەم سەردەمەدا ،ئەمانە وایان لیهاتبوو خەلکی بە سووك کەم بایەخ لێیان دەروانین ..؟! وە ئەمانەیان بە مرۆڤ دانەدەنا ، بەلکو لە لای ئاژەلەکانیان دەیان خەواندن ..؟!کەچی ئەمە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەر گیز رێگە پێدراو نیە و بەلکو تاوانە و قەدەغەکراوە ، بەلام لە بیر نەکەن ئێمە باسی دەولەتی ئەمەویی دەکەین کە خوێن ریشترین و ستەم کارترین فەرمانرەوا لە مێژووی ئیسلامدا (حجاج کوری یوسفی سەقەفی ) بووە ، چونکە ئەو فەرمانرەوایە دلێکی رەق حەسوود تەماحی زۆر هەبووە ، بۆیە هەرگیز بیری نەدەکردەوە کامە حەق رەوایە کامە چاکە کاریە ، بەلکو هەمیشە گوێرایەلی خەلیفەکەی خۆی دەکردو تەنها دەیوست (عبداللمك کوری مروان ) لێ رازی بێت ، نەك (خوای گەورە ) ئەمەش لە باسی هاوەلی بەرێز (ئەنسی کوری مالك ) و (حجاج ) بۆمان دەر دەکەوێت.

بەلێ لەدوایی رۆژەکانی فەرمانرەوایەتی (مصعب کوری زوبیر ) خەلکانی زەنگی لە فورات کۆبوونەوە ، بەلام لە ژمارەدا زۆر نەبوون ، ئەوە بوو خراپەکاریان کرد و مێوە کوشتوکالی خەلکیان وێران و لە ناوبرد ..؟! کاتێك (خالدی کوری عبداللە کوری خالد ) بووە فەرمانرەوایی شاری بەصرا ، ژمارەی خەلکانی زەنگی زیادی کرد ، ئەوە بوو خەلکی لەو بەلایەی کە زەنگیەکان بەسەریاندا هێنابوون هەستا سکالایان کرد ..!!

بەلام کاتێك هەوالی خراپەکاریەکەی زنگیەکانی پێ گەیشت ئەوە بوو کۆمەلێکی لەوان گرت و کوشتاری کردن ..!!

بەڵێ کاتێك (عبدالله كوری جارود ) ئەو بەڵایەی كە بەسەری داهات و راپەڕینەکەی دامرکا شکستی هێنا کە لە پێش دا باسمانکرد ، ئەوە بوو خەڵکانی زەنگی بزوتنەوەی راپەڕینی خۆیان دەست پێکرد و کۆمەڵێکی زۆر لەوانە لە فورات کۆبوونەوە و پیاوێکیان هەبوو بە ناوی (ریاح ) کە نازناو شوورەتی ( شێری زەنگی ) بوو ، ئەوە بوو خۆی کردە ڕێبەر و فەرماندەی زەنگیەکان و لە نێوان خۆیان ئەویان هەلبژارد ..!! دەگێرنەوە دەڵێن : ئەوان خراپەکاریان ئەنجام دەدا ..!! بەلام کاتێك (حجاج ) لە شەری (عبدالله كوری جارود ) تەواو بوو ، فەرمانی کرد بە (زیاد كوری عمرو ) كە فەرماندەی پاسەوانەکانی شاری بەصرا بوو ، سوپایەك بۆ کوشتاری زەنگیەکان رەوانە بکات ..؟! ئەوە بوو (زیاد ) ئەم کارەی ئەنجامدا سوپایەکی ئامادەکرد بە سەرکردایەتی ( حفص كوری زیاد ) کە کورەکەی خۆی بوو ، ئەوی رەوانەکرد بۆ شەرکردن لە گەڵیاندا ، ئەوانیش (حفص كوری زیاد )یان تێکشکاند و کورەکەی ئەویان کوشت ، پاشان سوپایەکی تریشیان رەوانە کرد بۆ کوشتاری زەنگیەکان خەڵکانی زەنگیان تێکشکاند و ئارامی بۆ شاری بەسرا گەرایەوە..؟!

دەگێرنەوە دەڵێن : کاتێك (حجاج) هاتە ناو شاری بەصرا ووتاری بۆ خەڵکی دا ..؟!

ووتی : ئەی خەڵکی بەصرا کۆیلە و گێسك لێدەر و نۆکەرەکانتان سەرپێچی ئێوەیان بینی هەر بۆیە ئەوانیش چاویان لە ئێوە کرد دەستیان لە خراپەکاری کرد ..!!

ووتی : سوێند بەخوا گەر نەچن بۆ ئەو سەگانە ئەوا خۆم چارەیان دەکەم بەس خورماکانتان بێ کەڵك و بێ بەرهەم دەکەم ، وە ئێوەش ریسوا دەکەم چونکە ئێوە ئەهلی ئەمانە نین ..؟!

هەر بۆیە خەڵکی بەصرا بەدەم بانگەوازیەکەی سەرزەنشت کردنەکەی (حجاج) وە چوون سوپایەکیان پێك هێناو ، ئەویش (كراز سلمی ) کردە فەرماندەی ئەو سوپایە ..!!

ئینجا روو بەرووی زەنگیەکان بوونەوە هەتا راپەڕینەکەیان کۆتایی پێ هێنا و سەرکردەی زەنگیەکان کە (ریاح یان شێری زەنگی ) بوو کوشتیان تەنها کەمێکیان رزگاریان بوو ، کوشتاری هەموویان کردن ..!!

## راپه‌رینه‌كه‌ی (مترف كوری مغیره كوری شعبه ) له دژی (حجاج)

به‌ڵێ (مترف كوری مغیره ) كوری هاوه‌لی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بوو ، كه ناوی (مغیره‌ی كوری شعبه ) بوو ، ئه‌و هاوه‌له به‌ڕێزه یه‌كێك بوو له پشتیوانیه كانی بنی ئومه‌یه ، چونكه یه كێك بووه له یارمه‌تی ده‌ره‌كانی (معاویه‌ی كوری سفیان ) ئه‌ویش كوره‌كه‌ی له باوكیه‌وه بۆی مابوویه‌وه ئه‌م دلسۆزیه بۆ بنی ئومه‌یه یان خلافه‌تی ئومه‌یه ، ئه‌وه بوو كوره‌كانی ئه‌م هاوه‌له به‌ڕێزه هه‌ر یه‌كه‌یان له ده‌وله‌تی ئومه‌یه كاربه‌ده‌ست بوون ، وه‌كو (عروه كوری مغیره ) له شاری كوفا بوو ، و (حمزه كوری مغیره ) له هه‌مه‌دان ، و (مترف كوری مغیره) له شاری مه‌دائن بوو.!!

ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : كاتێك (مترف كوری مغیره كوری شعبه ) له شاری مه‌دائن بووه كار به‌ده‌ست، ووتاری بۆ خه‌لكه كه‌ی داو ووتی : ئه‌ی خه‌لكینه فه‌رمانره‌وا (حجاج) خوا چاكی بۆ بكات ، وه منی كردۆته والی ئێوه رای سپاردوم كه راست و ره‌وان دادگه‌ری له نێوان تان بكه‌م ، جا ئه‌گه‌ر به‌م جۆره ئه‌م كاره‌م كرد ئه‌وا به‌خته‌وه‌ر ترین مرۆڤی سه‌ر زه‌ویم ..!! ئه‌گه‌ریش كاره‌كه‌م به باشی نه‌كرد ئه‌وا خۆم له ناو بردووه ، وه خۆم فه‌وتاندووه و به‌دبه‌ختی دونیاو قیامه‌ت بوومه..؟!

(مترف ) به خه‌لكه كه‌ی ووت: هه‌ر كات له گه‌لتان دانیشتم ، ئه‌وا پێویستیه‌كانتان بۆ لای من به‌رزكه‌نه‌و سكالاكان بێنه لای من ، و پرس راوێژم له گه‌لدا بكه‌ن له‌و كارانه‌ی بۆ خۆتان و بۆ شاره‌كه‌تان چاكه و باشه ..؟! ووتی : به‌راستی من كاری خێرو چاكه‌تان ره‌ت ناكه‌مه‌وه تاكو بتوانم ..؟!

به‌م جۆره له ووتاره‌كه‌ی بوویه‌وه له سه‌ر ته‌ختی ووتاردان هاته خواره‌وه ، ئینجا دلسۆزی بۆ فه‌رمانره‌وایه‌كه‌ی كه (حجاج) بوو ده‌ربری پاشان دلسۆزی خۆی بۆ ده‌وله‌تی ئه‌مه‌ویه‌كان دووبات كرده‌وه ..!!

پاشان بۆ وەلامدانەوە خەلکی شاری مەدائن ، یە کێکیان هەلبژارد بۆ وەلامدانەوە ئەویش پیاوێك بوو بەناوی ( حكيم کوری حارث الازدي ) ئەم کەسە یەکێك بوو لە پیاوە ماقولە کانی ئەم شارە.

(حكيم ) ووتی : خوا چاکت بۆ بکات من لە تۆ دوور بووم کاتێك قسەت دەکرد بۆیە هاتم بەرەو لات تاکو وەلامتد بدەمەوە ، ئێمە لە تۆ تیٚ گەیشتین لەو ووتارەی بۆت باسکردین ، ئەوە بەلێن و پەیمان بیٚ بۆ تۆ ، (خوای گەورە ) ڕێگای ڕاست پێشانی پەیماندەرو پەیمان پێدراو بدات ، هیواو ئاواتی دادگەری بۆ خۆت خواستووە ، هەروەها داوای یارمەتی و هاوکاریت کردووە لە سەر حەق ڕاستی ، (خوای گەورە ) یارمەتی و پشتیوانت بێت لە سەر نیاز پاکیەکەت و دلسۆزیەکەت، هەروەها (حكيم ) ووتی : تۆ لە باوکت دەچیت ، مەبەستی پێی ( مغیرەی کوری شعبە ) بوو ، چونکە باوکت لە ژیاندا (خوای گەورە) و خەلکیش لێی ڕازی بوو ..؟!

ئەوە بوو (مترف ) لە سەر دلسۆزی خۆی کار بەدەستی خۆی مایەوە بۆ فەرمانڕەوای عێراق (حجاج کوری یوسفی سەقەفی ) هەر چاکەو دادگەری دەکرد لە نێوان خەلیکی دا ..!!

پاشان پیاوێك لە خەواریجەکان دەرکەوت بە ناوی (شبیب کوری یزید ) ئەم پیاوە ڕاپەرینی بەرپاکرد دژی فەرمانڕەوای عێراق کە (حجاج) بوو ، هەروەها دژی دەولەتی ئەمەیەکان و دژی (عبدالملك کوری مروان ) ئەم پیاوە کە (شبيب ) بوو ویستی بێتە شاری مەدائن بۆ داگیر کردنی ، پاشان (مترف ) پردی ڕووباری دیجلەی شکاند یان بری ،تاکو نەهێلێت بپەڕێتەوە بگەنە ناو شارەکە ، پاشان (مترف ) نامەی نارد بۆ (حجاج ) هەوالی ڕاپەرینەکەی (شبيب )پیٚ ڕاگەیاند..!!

ئینجا (حجاج) سوپایەکی بۆ ڕەوانەکرد لە چوارسەد جەنگاوەر پێکهاتبوو بە فەرماندارى ئەم دوو پیاوە (سبره کوری عبدالرحمن ) وە (عبدالله کوری کناز ) ، پاشان (حجاج) ئەوە بوو (مترف)یشی نارد بە دوایی (شبيب ) کە گفتو گۆو دانوساندو ڕێکەوتنی لە گەلدا بکات ، بە (مترف) ووت : کە هەندێك لە پیاوەکانت بنێرە بۆ لای (شبيب ) ئەویش با هەندێك پیاوەکانی خۆی بۆ لای تۆ بنێریٚ وەکو بارمتە لە لات بێت ، بۆئەوەی ڕێگەتن و دانوساندنی لە گەلدا بکەیت ..؟!

بەلام کاتێك (مترف ) گفتو گۆی لەگەل پیاوەکانی (شبیب ) کرد باوەڕی به ڕاو بۆ چوون و تێڕوانینەیان هێنا لە بارەی هەلگەڕانەوەی لە خلافەتی ئەمەویەکان کە بە سەرکردایەتی (عبدالملك کوری مروان ) هەروەها فەرمانڕەوایی عێراق (حجاج کوری یوسفی سەقەفی ) ، ئەویش داوای ببنە شوێنکەوتەی ئەو و دەستیان بخەنە دەستیەوە ..؟!

پیاوەکانی (شبیب) ووتیان: بە (مترف ) چی دەزانی دەربارەی ئەمانە پێمان بلێ ئەگەر زانیمان ڕاستە ئینجا وەلامت دەدەینەوە ..؟!

(مترف) ووتی: بەراستی من بانگتان دەکەم بۆ بەرنگار بوونەوەی ئەو ستەکار و زۆردارانە ، مەبەستی خلافەتی ئەمەویەکان و (حجاج) بوو ..!!

ووتی : ئێمە بانگەواز دەکەین بۆلای قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، دەمانەوێت کارو بارەکان بە ڕاوێژ بیت لە نێوان موسلمانان‌دا ، وە ئەوەی لێی ڕازین دەکەین بە فەرماندارو فەرمانرەوایان ، وەکو ئەوەی (عمری کوری خەتاب ) کردی لە سەری عەرەب ، وە گەر زانیان کە مەبەست لە ڕاوێژ و ڕازیبوونە بە (قورەیش ) ڕازی دەبن و شوێنکەوتوو تان زۆر دەبێت لەوان ، هەروەها یارمەتیتان دەدەن دژی دوژمنەکەتان ، پیاوەکانی (شبیب) واتە : خواریجەکان ووتیان: بۆ ئەمە وەلامت نادەینەوە ..؟!

چونکە خواریجەکان پێیان باش نەبوو کە هەر خەلافەت بەس بۆ (قورەیش ) بێت جگە بە کەسانی دی ، هەر لەبەر ئەوەش بەر پەرچی داواکەیان دایەوە کە پێشنیاری لابردنی سەرکردەکەیان (شبیب کوری یزید) ی بۆ کردن کە وان پێیان دەووت : ئەمیری باوەڕداران ..!!

ئینجا گەڕانەوە بۆ لای (شبیب) و ئەوەی (مترف ) باسی بۆ کردبوون پێیان ڕاگەیاند و گفتو گۆو دانوساندنەکەی نێوانیان نەگەیشتە هیچ ئاکامی پێویست ..!!

بەلام ئەم گفتو گۆیەی نێوان هەردوو لا بە نهێنی مایەوە ، کەچی یەکێك لە پیاوەکانی (مترف ) کە ناوی ( یزید ) بوو کاربەدەستی (مترف ) بوو ، ئەوە بوو بە (مترف)ی ووت : سوێند بە خوا ئەوەی نێوان تۆ و نێوان ئەوانە تەنها یەك کلمەشی لە (حجاج) شاراوە نابێت ،وە هەر کلمەیەك دە کلمەی تری بۆ زیاد دەکرێت ، هەر بۆیە ئەگەر وەك هەور و رەشەباش راکەی (حجاج) هەر دەست بەسەرت دەکات و دەگرێت تاکو لە ملت دەدات یان سەرت دەپەرێنی ، رزگار بوونیشت لەم شوێنەیە کە تێدا کار بەدەستی ، بەراستی خەلکی مەدائن ئەم لاو لەو لایە شەوە ، باسی دەکەن ، هەروەها پیاوەکانیش (شبیب) یش باسی رێکەوتن گفتو گۆی ئێوە دەکەن ، وە ئەمرۆ ناگاتە ئێوارە هەوالەکە بە (حجاج) دەگات ، کەواتە شوێن جێگایەکی تر لە شاری (مەدائن ) هەلبژێرە ..؟!

بەلێ هەر بەراستی (مترف ) گوێی بۆ ئامۆژگاریەکەی (یزید) گرت و شاری (مەدائن) جێ هێشت ، لە ترسی (حجاج ) رای کرد ، وە ئەو کەسانەشی هاتبوونە رێزی راپەرینەکەی یان بزوتنەوەکەی کۆی کردنەوە پاش ئەوەی (مەدائن ) جێ هێشت ، پیاوەکانی خۆی هانی دان بۆ جیهاد کردن گەواهی دان بۆ لە سەر کار لابردنی (حجاج کوری یوسفی سەقەفی ) وە (عبدالملك کوری مروان ) لە خەلافەتی ئەمەویەکان ، هەروەها بانگەوازی کرد بۆ قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها کاروبارەکان دەبێتە راوێژ کردن لە نێوان موسلماناندا ..؟!

بەلێ (مترف ) ئەو سەبازانەی کە لە گەلیدا بوون رۆیشتنە (دەسکەر) بەرەو (حلوان ) فەرمانرەوایی ئەم شوێنە (سوید کوری عبدالرحمن السعدی ) بوو ، ئەم (سوید ) خەلکی شارەکەو کوردەکان لی کۆببونەوە ..!!

(سوید) پەیامێکی نارد بۆ لای (مترف) ووتی : ئەگەر ئێوە شارو ولاتەکەی ئێمەتان دەوێت ئەوا ئێمە ریگریتان لێدەکەین ، ئەگەر ناشتاندەوێت لیّ بچنە دەر، چونکە ئێمە پێمان خۆش نیە خەلك پێیان وابیّ ئێمە ئێوەمان دەر کردووە و شوێنمان نەکردۆتەوە بۆ تان ..؟!

پاشان (مترف) بە داواکەی (سوید) ڕازی بوو ، وە نەچووە ناو شارەکەو ، وە جەنگیشی لەگەل نەکردن ، کەچی کوردەکان بووبە شەڕیان لە گەل پشتیوانەکانی (مترف) دا وڕێگریان لێکرد ن لە یەکێك لەو ڕێگایانەوە بڕۆن کە (سوید) بۆ نەخشە کێشابوون ، بەلام کوردەکان تێکشکان و زۆریان لێ کۆژرا ..؟!

بەلام دواتر (مترف ) بە خۆ بە سوپاکەیەوە ڕۆشت هەتا نزیك بوویەوە (هەمەدان) ، بەلام نەچووە ناو شارەکە ، بەرەو لای چەپ ڕۆیشت بەرەو (ماه دینار ) ، ئەوە بوو لە شاری (هەمەدان ) دوایی لە براکەی کرد کە بەناوی (حمزە کوری مغیری کوری شعبە ) بوو ، داوایی لێ کرد کە پارە چەك کەستەی جەنگی پێ بدات ئەویش داوای براکەی جێ گەیاند بە نهێنی ،بەلام (حجاج) بەمەی زانی.

پاشان لە لای براکەی ڕۆیشت ڕووی کردە شاری (قوم) لە ولاتی فارس ، هەروەها نامەشی نووسی بۆ شارەکانی (قاشان ) و (ئەصفەهان) بۆ ئەم دوو کاربەدەستەی ئەوێ ، کە (سوید کوری سەرحان سەقەفی ) و ( بکیری کوری هارون بجلی ) ی هاورێ ، ئەویش داوایی لەمانەکرد بێنە نێو ئەم ڕاپەرینەو بزوتنەوەیە دژی فەرمانڕەوایی (حجاج) خەلافەتی ئەمەویەکان ، ئەوانیش هاتن بەدەم داواکەی (مترف ) هاتنە ڕیزی ئەم ڕاپەرینەی(مترف )لە کاتێك شوێنکەوتوانی زۆر بوو..؟!

بەلام یەکێك لە فەرماندەکانی (حجاج) لە شاری (ئەصفەهان) بوو بەناوی( برائی کوری قبیصە ) ترساو لەم ڕاپەینەی ئەمانە ، هەر بۆیە نامەیەکی نووسی بۆ (حجاج) داوای لێکرد سوپایەکی گەورەی بۆ بنێرێت بۆ لە ناو بردنی ئەم ڕاپەرینە کە بە سەرکردایەتی (مترف) بەر پا ببوو ..! !ئەوە بوو (حجاج) فەرمانی پێکرد سەر بازەکانی خۆی کۆبکاتەوە ، لەگەل پێنچ سەد سەر بازیشی بۆ ڕەوانەکرد بۆ ئەوەی ڕووبە ڕووی (مترف ) و شوێنکەوتووەکانی ببنەوە ، ئیتر نزیکەی سەربازەکانی ( برائی کوری قبیصە ) بوونە بە شەش هەزار جەنگاوەر بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوە (مترف ) ..؟!

ئیتر (مترف ) بەمەی زانی کە ژمارەی سەربازەکانی (برائی کوری قبیصه) زۆرن ، هەر بۆیە هانی شوێن کەوتوانی خۆی دا بۆ جەنگ کردن دژی سوپا گەورەکەی (حجاج) کە (برائی کوری قبیصه) فەمانداریەتی دەکرد، بەلام (مترف )یش هەولی دا پێشەوایی سوپاکە رابکشێت بۆ خۆی ، هەر بۆیە پیٚ ووت : لە بارەی (حجاج) و (عبدلملك کوری مروان ) راو بۆ چوونی خۆتان بدەنیٚ ..؟!

ووتی: ئایا ئێوەش وەك دوو زۆر دارو ستەمکار نایان بینن..؟! یان ووتی : ئەم دووانە کە شوێن هەواو هەوس ئارەزووکانی دونیا کەوتوون ..؟! ووتی: ئەم دووانە بە گومانێك خراپ خەلکی دەگرن دەبنە زیندا و خەلکی لە سێدارە دەدن یان ملی دەپەرین و دەی کۆژن بە ناحەق ..؟!

فەرماندەی سوپاکەش پیٚ ووت : ئەی دوژمنی خودا تۆ درۆ دەکەیت ، ئەوان هەر گیز وانین..؟!
بەلام لەراستی دا ئەوان لەم سەردەم وابوون زۆر زولم ستەمیان دەکرد بە ناحەق و نارەوا ..!!

ئیتر جەنگ و کوشتری قورس و خوێناوی لە نێوانیاندا روویدا ، هەر دوو لە زۆر بە توندی کوشتاری یەکتریان کرد ، لە ئەنجامدا جەنگە کە بە شکستی (مترف ) شوێن کەوتووەکانی کۆتاییهان ..!!

لەم جەنگەدا (مترف ) بە دەستی پیاوێك بەناوی (عمری کوری هوبەیرەی فەزاری ) کوژرا ، وە سەری لەملی کردەوە وەك نەریتی ئەو سەردەمەسەرەکەی نارد بۆ(حجاج کوری یوسفی سەقەفی) پاشان (حجاج) براکەی (مترف ) کە ناوی (حمزه کوری مغیره کوری شعبه ) بوو ، ئەویشی دوور خستەوە و لە سەر کارەکەی لای برد لە شاری (هەمەدان ) ، پاشان ئەوەشی زانی کە بە مال و پارە و چەك یارمەتی براکەی داوە ، پاشان دەست بەسەری کرد لە لای خۆی نەوەك ئەویش راپەرین بەرپا بکات لە تۆلەی براکەی ..؟!

بەلیٚ بەمە راپەرینەکەی (مترف) کۆتایی پیٚ هات ئەم رووداوە لە سالی (٧٧) کۆچیدا روویدا ، بەلام ئەم راپەرینە (حجاج) زۆر بە ئاسانی کۆتایی پیٚ هێنا ، بە پێچەوانی راپەرینەکانی تر وەك خواریجەکانی (صفریه ) راپەرینەکەی (کوری ئەشعەس ) خەریك بوو کۆتایی بە (حجاج) بهێنن، کە لە دوایی دا باسیان دەکەین ..!!




## ڕاپەرینەکەی (کوڕی ئەشعەس ) لە دژی (حجاج)

(کوری ئەشعەس ) ئەو پیاوە بوو کە ناوی (عبدالرحمن کوری محمد کوری ئەشعەس کوری قیس الکندی ) بوو ، یەکێك بوو لەو فەرماندانەی کە (حجاج) ناردی بۆ (سجستان ) بۆ شەری پاشای (ترك ) ، پاشان راپەرینی لە دژی (حجاج) و (عبدالملك کوری مروان ) بەر پاکرد ، وە چەندی زانا هاتنە ریزی ئەم پیاوە ، ئەم زانایانە وەکو (سعید کوری جبیر ) و (الشعبی ) ، بەلیٚ سەر تایی راپەرینەکە لە سالی (٧٨) کۆچیدا روویدا ، کاتێك ئەمیری باوەرداران (عبدالملك کوری مروان ) ولاتانی (خۆرستان ) و (سجستان) ی خستە ژێر رکێفی دەولەتی ئەمەویەکان ، ئەوە بوو کە (کوری ئەشعەس ) فەرماندەی دەولەتی خلافەت بوو ، لە گەل (حجاج) ناکۆکی رقیان لە یەکتری بوو ، دەویست جەلەوی فەرمانرەوایەتی لە (حجاج) بستێنێت ، بەلام (حجاج)یش دەویست لە ناوی ببات یان خۆی لە (کوری ئەشعەس ) رزگار بکات ، هەر بۆیە بە سیاسەتێکی خۆی (کوری ئەشعەس ) نارد بۆ فەرمانرەوایەتی ولاتانی (سجستان ) بۆ بەرنگار بوونەوەی پاشای (ترك) کە ناوی (زنبیل) وەك لە (سیره أعلام النبلاء )داهاتووە ، هەندێکیش دەلێن : ناوی (رتبیل ) بووە،

لە (الشعبی ) دەگێرنەوە دەلێت : لە لای (حجاج) دانیشتبووم کە (عبدالرحمن کوری محمدی کوری ئەشعەس ) خۆی کردە بە ژوورەکەیدا کاتێك (حجاج) چاوی پێکەوت ..!!

ووتی: سەرێری رۆیشتنەکەی بکە ، بە خوا زۆرم بدەم لە گەردنی ..؟!

(الشعبی) دەلێت : جا کاتێك (کوری ئەشعەس ) چووە دەرەوە ، منیش پێشی کەوتم لە لای دەرگای (سعیدی کوری قیسی صبیعی ) چاوەرێم کرد ، کاتێك گەیشتە لای دەرگاکە منیش پێم ووت: لە دەرگایە وەرە ژوورەوە لە گەلمان من دەمەوێت قسەیەکت بۆ بکەم ،ئەمانەتێکم پێیە لات بیٚ تا (حجاج ) زیندوو بێت هیچ کات باسی نەکەیت ..؟!

ئەوە بوو منیش قسەکەی (حجاج)م پێ ڕاگەیاند ، کە لە بارەی (کوری ئەسعەش ) ووت بووی ، بەلام (کوری ئەشعەس ) ووتی : منیش هەر وەك (حجاج) دەکەم و ڕەقم لێ دەبێت ،بەلام ئەگەر نەشتوانم لە دەسەلات بیهێنمە خوار و لاییدەم ، ئەوا هەول و کۆششی بۆ دەدەم ، وە دریخی ناکەم تاکو هەردووکمان لە ژیاندا مابین ..!!

ئەوە بوو (حجاج) سوپایەکی چل هەزار کەسی لە خەلکی کوفا و بەصرا ئامادە کرد بە فەرماندارێەتی (کوری ئەشعەس ) لە خەلکی کوفا و بەصرا ..؟!

لە (تەبەری ) دەگێرێتەوە دەلێت : ئەو سوپایەی (حجاج) بۆ (کوری ئەشعەس) ئامادەکرد کە بیست هەزاریان لە شاری کوفە بوون ، بیستەکەی تریش لە خەلکی شاری بە صرا بوون ..!!

دەگێرنەوە دەلێن : مامی (کوری ئەشعەس ) کە ناوی ( اسماعیل کوری ئەشعەس ) بوو ، ئەم پیاوە هاتە لای (حجاج ) پێی ووت : برازاکەم مەکە فەرماندەی ئەم سوپا زۆر دە سوێند بەخوا مەترسی ئەوەم هەیە دژتان بوەستێتەوە ، بە خوا هەر پردی ڕووباری فورات تێپەڕاند ، ئەوە فەرمانرەوایەکی تری بینی یەکسەر دەچێتە ژێر ڕکێفی ئەو لە دژتان دەوەستێتەوە ملکەچی گوێرایەلی ئەوان دەبێت ..؟!

(حجاج) ووتی : لەوێ ئەوەی بۆ دەست نادات ، خۆ من حەزم لێیە سەرپێچی فەرمانەکەم بکات و لە فەرمانم دەربچێت ..؟!

دەگێرنەوە دەلێن : کاتێك (عبدالله کوری ابی بکر ) وەفاتی کرد ، سالی (٨٠) کۆچی بوو ، ئەوە بوو (حجاج) نامەی نووسی بۆ (کوری ئەشعەس ) کردیە فەرمانرەوایی ولاتی سجستان ، ئەو کات یەك ملیۆن سەرباز یان جەنگاوەری تری خستە سەر ئەو سوپایە کە ئامادەی کردبوو..!! ناوی ئەو سوپایەش (سوپای تاوسەکان ) بوو ، کە ئەو کاتە (حجاج) خۆی فەرمانرەوایی هەموو عێراق ولاتانی رۆژ هەلات بوو ، بۆ هەر ولایەتێکیش کار بەدەستێکی دانابوو، خۆی ئەم کار بەدەستی ناردبوو تاکو لە ژێر فەرمانرەوایی ئەو دابێت و فەرمانەکانی جێ بەجێ بکات ..!!

کاتێك (کوری ئەشعەس ) گەیشتە ولاتی سجستان خەلکە کەی کۆکردەوە ، ئەوە بوو سەر کەوتە سەر مینبر یان تەختی ووتاردان ، سوپاس ستایشی (خوای گەورە) ی کرد پاشان دەستی کرد بە ووتار دان ، ووتی : ئەی خەلکینە فەرمانرەوایی هەموو عێراق و ولاتانی رۆژ هەلات کە (حجاج) منی کرد کار بەدەست یان فەرمانرەوایی یان والی ناوچەکەی ئێوە ..؟!

ووتی : (حجاج) فەرمانی پێکردم کە جیهادو تێکۆشان بکەم لە پێناوی رزگار کردنی خاکە کەی ئێوە ، کە دژی ئەو دوژمنانەی کە ولاتەکانی داگیر کردووە ، خێرو بێرە کانتانی بردووە ..؟!

ووتی : هەر گیز نەکەن هیچ پیاوێکتان دوا بکەوێت و سەر پێچی بکات سزا بە خۆی بگەیەنێت، رۆن برۆن بۆ خێوەتکەی سوپاکەو لە گەل سوپاکە کۆمەل بەستن ..؟!

ئەوە بوو خەلکی هەر هەموو بەدەم داواکەی چوون و لە خێوەتگەی سوپاکە کۆ بوونەوە ، بەشی دواوەی سوپاکەی بۆ دەست نیشان کردن ئەوانیش دەستیان کرد بە خۆ ئامادەکردن بە کەرەستەکانی شەر کردن ..!!

ئەوە بوو فەرمانرەوایی سجستان کە (زنبیل یان رتبیل ) بوو ، بە کۆ بوونەوەی خەلکی زانی و ، کە هێزێکی زۆر لە دەوری (کوری ئەشعەس ) کۆ بوونەتەوە ، پاشان (رتبیل ) ستایشی بۆ (کوری ئەشعەس) کردو ، وە داوایی ئاشتی صولحی لێکرد ، وە پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد کە باجی لێ وەربگرێت ، بەلام (کوری ئەشعەس ) وەلامی (رتبیل ) نەدایەوە بە سوپاکەیەوە رۆیشت بەرەو خاکی (رتبیل) ، کە هەر ئەوەندەی پێکرا واز لە روو بەروو بوونەوەی ئەم سوپا زۆر بهێنێت ، لە بەردەمیان کشایەوە ، ئتر ئەوە بوو (کوری ئەشعەس ) دەستی کرد بە سەر رووبەرێکی زۆری خاکەکەیدا و قەلایەکی زۆری فتح کرد ، ئەوە بوو (کوری ئەشعەس ) والی یان کاربەدەستی بۆ هەر شارێك دانا ، وە هێزێکی بۆ پاراستنی ئەو شارە جێ دەهێشت کە فتحی کردبوو ..؟!

دەگێرنەوە دەلێن: تەنانەت ئەو خەلکەی کە لەگەلی دابوون بە (کوری ئەشعەس) یان ووت : بەس نیە ئەمسال ئەوەنەمان لە ولاتەکەیان فتح کردووە ، هەتاکو باج یان لێ وەردەگرێت دەیان ناسیت ، پاشان دوای ئەوە بۆ سالی دابێ خۆمان دەکەین بە شارێکی تر یان خاکێکی تر فتح دەکەین..؟!

ئینجا (کوڕی ئەشعەس ) نامەیەکی نووسی بۆفەرمانڕەوایی عێراق( حجاج کوڕی یوسفی سەقەفی) لە نامەکەی دا سوپاسی (خوای گەورە ) کرد بوو ، کە ئەم هەموو سەرکەتنەی پێ بەخشی بوو ، لە فتح کردنی ئەم خاك و ولاتانە ، هەر لە نامەکەیدا بەرەو پێش چوونەکانی خۆی بە (حجاج) ڕاگەیاند بوو ، لە سەر کەوتن فتح کردنی خاك دەستکەوتەکانی جەنگی و غەنیمەتەکان ، وە ئەم پێشنیارەش کە خەلکی بە (کوڕی ئەشعەس ) یان ووتبوو ، ئەویش پێ ڕاگەیاند بوو ..؟!

پاشان (حجاج) بە زمانێکی زۆر نارشرین و زبر وەلامی نامەکەی (کوڕی ئەشعەس ) دەداتەوە..؟!

(حجاج) ووتی : لە پاشان ... نامەکەتم پێ گەیشت ، ئەوەی باست کردبوو تیایدا تێ گەیشتم ، لە نامەکەت نامەی کەسێکە کە حەزی لە وچان و پشوودان بێت ..؟! وەك ئەوەی دوژمنێکی کەم لاواز و بێ دەسەلات خراپی پێ کردبێت ، بەلایەکی باشیان بەسەر موسلماناندا هێنابێت ، دەستکەوتێکی زۆریشیان لە ئیسلام و سوپای ئیسلام چەنگ کەوتبێت ..؟!

(حجاج) ووتی: بە تەمەنت ئەی (کوڕی ئەشعەس ) گەر تەنها یەك سەربازیشت لە ناو بچێت بۆ کۆتایهێنان بەم دوژمنە ، ئەوا سەخاوەتی دەست دلت باشە ، چونکە یەك موسلمان هاوتای هەموو سوپاکەی دوژمنەکانە ..؟!

(حجاج) ووتی: من دوژمنایەتیت ناکەم لە گەر ڕاو پۆ چوونە کەت ، کە خۆت بە فێل و پیلانت زانیوە بۆ هەنگاوەکانی دوا ترت ..!! بەلکو وای بۆ چوون ئەوەی هانی دایی بۆ ئەو پشوودانە ، ئەمە هۆی لاوازی تۆیە ..!! یان ڕاو بۆ چوونی هەلە تە ..!!

(حجاج)ووتی : بەردەوام بە لەسەر ئەوەی فەرمانم پێ کردیت لە چوونە ناو خاکەکەیانەوە ، و تێکدان و خاپوور کردنی قە لاو پەناگاکانیەوە، وە کوشتنی شەرکەیان جەنگاوەرە کانیانەوە..؟!

پاشان بەدوای ئەو نامەیەی وەلامدانەوەی (حجاج) نامەیەکی تریشی نارد کە تێدا هاتبوو :

(حجاج) پێ ووتبوو : بەردەوام لە سەر فتح کردن خاکە کەیان ، وە یان لە سەر ئەوەی کە فەرمانم پێ کردیت .؟! ئەگەر نا فەرماندەیەکی تر لە جێگەی تۆ دەست نیشان دەکەم و دەنێرم ، ئەو فەرماندەیەش کە برای تۆیە ناوی (ئیسحاق کوری محمد کوری ئەشعەس ) برای خۆتە دەبێتە فەرماندەی خەلکەکە ئەو کارە دەکات ..!!

هەر بۆیە (کوری ئەشعەس ) لە ریسوایی و سوکایەتی (حجاج) زۆر توورە بوو ، خەلکی کۆ کردەوە ووتی : ئەی خەلکینە من ئامۆژگارتانم ، حەزم بە چاکەی ئێوەیە ، تەماشا بکەن بزانن چی بە سوودە بۆ ئێوە ..!! لە وەی لە نێوان ئێوەو دوژمنەکانتاندا هەبوو ، بە (حجاج) راگەیاند ، پرسم بە گەورەکانی ئێوە کرد لە ناوە خۆتان ، هەر بۆیە رازی بوون بە راو بۆ چوونێك کە کردتان ، منیش نامەم نووسی بۆ فەرمانرەوایی گشتی (حجاج) پاشان ئەو ولامی نامەکەمی دامەوە تێدا سەرزەنشتی کردم و سووك ریسوایی کردم ..!! فەرمانم پێ دەکات کە هێرش بکەم بۆ خاکی دوژمندا ، کە ئەم ولاتەیە دوێنی براکانتان هیلاك و ماندوو بوون ، کەواتە ئێستا من پیاوێکم لە گەل ئێوە بۆ هەر کوێ بچن یان نەچن ..!!

بەلێ هەر لەبەر ئەم ووتارە ئاگرینەی (کوری ئەشعەس ) لە سجستان ، خەلکی ورووژاندو هانی خەلکی دا ، ئەوانیش ووتیان : نەخێر . بە گوێی دوژمنی خوا ناکەین ، گوێی لێ ناگرین وە گوێرایەلی فەرمانەکانی نابین ..!! مەبەستیان فەرمانرەوایی گشتی (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) بوو ..؟!

بەلێ لە پاشان (کوری ئەشعەس ) بە خەلکەکەی و سوپاکەی ووت : کەواتە (حجاج) دوژمنی خوایە ، لای دەبەین ، بەیعەت بەمن بدەن ، منیش شایەتیتان بۆ دەدەم یەکەم کەس دەبم لە (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) یاخی بووم و وازی لێ بهێنم ..؟!

ئینجا دواتر لەم باسە لە ناو خەلکی بلاو بوویەوە ، بەدەم داوایەکەی (کوری ئەشعەس ) هاتن دەستە دەستە کۆمەل کۆمەل ، پاشان ووتیان : ئێمە بەیعەتماندا ئێمە وامان کرد ، ئێمە وامانکرد، دوژمنی خوامان لە فەرمانرەوایی خۆمان پاك دەکەینەوە ..؟! ئینجا خەلکەکە هاتن بۆ لای (کوری ئەشعەس ) پەیمانیان پێ دا ، ئەویش پێی ووتن : ئایا پەیمانم پێ دەدەن لە سەر لابردنی (حجاج) و پشتیوانی بۆ من وەستانەوە لە دژی (حجاج) لە گەل من هەتاکو (خوای گەورە) لە خاکی عێراق دەیکاتە دەرەوە ..؟! لەسەر ئەم بنەمایە خەلکی پەیمانی دا باسی لابردنی خەلیفەی موسلمانان (عبدالملك کوری مروان ) نەکرا ،ئەو راپەرینە لە سالی(٨١) کۆچی دابوو..!!

ئەوە بوو سوپایی (کوری ئەشعەس ) بۆ عێراق بەرێکەوت ، کوشتار کردن و لابردنی (حجاج) ، وە فەرماندەی سوپاکە ( عطية کوری عمرو العنبري ) بوو ، سوپاکە گەیشت ، بەلام (حجاج) چەند سوپایەکی لە (الخياله ) نارد بۆی (عطية ) تێك شکاند ..!!

بەلێ خەلکی زۆر هاتنە رێزی راپەرینەکەی (کوری ئەشعەس ) لە ولاتی فارسدا ، بەدەر لەوانیش و هۆکارەکەی زولم ستەمی (حجاج) بوو ، چونکە لە هەر شوێنێك یان لە هەر خاکێك ، گوێ بیستی نارەزایی و راپەین ببونایە ، ئەوا خەلکی دەستە دەستە و پۆل بە پۆل دەچوونە رێزی بزووتنەوەی راپەرین دژی زولم ستەم و زۆرداری و خوێن رشتنی (حجاج) ، هەروەها خەلکی پشتیان لەو فەرمانرەوایەش دەکرد کە (حجاج) دایْنابوو ، پیاوێك لە ناو خەلکە کە هەستایەوە مەبەستی ئەوە بوو کە (عبدالملك کوری مروان) بگۆرن ، ئیدی زۆر خەلکی تریش داوایی گۆرینی (عبدالملك کوری مروان ) یان کرد ..؟!

بەڵێ شێوازی بەیعەت پێدانەکە بە (کوری ئەشعەس ) بەم جۆرە بوو : بیعەتت پێ دەدین لە سەر قورئان و فەرمووده و رێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ ،وەگۆرین و لابردنی فەرمانرەوا گومراکان..!!

ئینجا (حجاج) نامەی نووسی بۆ خەلیفەی موسلمانان (عبدالملك کوری مروان ) هەوالی راپەرینەکەی پێ گەیاند ، دوتریش گوری بۆ ئەوەی بەیعەت وەربگرێت ، بۆ بوون بە خەلیفە لە جێگای (عبدالملك کوری مروان ) ..!!

پاشان هەندێك لە زانایان و پیاو چاکان و ئەوانەی ئامۆژگاری باشیان پێ بوو ، هاتنە نێوانیان لەوانە : فەرماندە (مهلب بن ابی صفره ) نامەی نارد بۆ (کوری ئەشعەس ) ئامۆژگاری کرد و هۆشداری دایە لە سەر رەوشەکە کەبۆتە دوو بەرەکی لە نێوان موسلمانان ..!!

نامەی بۆ نووسی : ئەی (کوری ئەشعەس ) تۆ پێت خستۆتە ناو راپەرینێکی دوورو درێژەوە ، لێی پارایەوە ووتی : توخوا توخوا لە سەر سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بمێنەوە ..!! لە خۆ بروانە و خۆت وێران مەکە ، خوێنی برا موسلمانەکان مەرێژە ..؟! ئۆمەتی موسلمانان مە کە بە دوو لەتەوە یان دوو بەرەکی دروست مەکە ..؟! پەیمان مەشکێنە ..؟! ئەگەر ووت: من لە خەلکی دەترسم ، ئەوا (خوای گەورە ) لە پێشترە لێ بترسیت وەك لە خەلك ..؟! خۆت تووشی خوێن رشتن و حەلالکردن حەرامێك مەوە..؟! والسلام علیکم ...؟!

هەروەها نامەشی نووسی بۆ (حجاج ) ووتی: بەراستی خەلکی عێراق هیچ شتێك رێگەیان پێ ناگرێت بۆ ئەوەی بگەرێنەوە نێو کەس و کارو خێزان مندالەکانیان ،ئەوان روو بەرووت دەبنەوە. مەبەستی ئەو چل هەزار جەنگاوەر بوو لە خەلکی کوفا و بەصرا لە گەل (کوری ئەشعەس ) چوون بۆ فتح کردنی ولاتی (سجستان ) ، چونکە پێ وابوو ئەوان بە پەرۆشەوە راپەین دەکەن و دەگەرێنەوە بۆ ولاتەکەیان ناو کەس کاریان ..!!

پاشان ووتی : بە (حجاج ) خوا سەرت بخات بە سەریاندا (ان شا الله ) ...

بەڵێ (عبدالملك كوڕی مروان ) دەستی كرد بە ئامادە كردنی سوپایەك كە (حجاج كوڕی یوسفی سەقەفی ) فەرماندایەتی دەكرد ، بۆ شەری (كوڕی ئەشعەس ) ئەوانە لە دەورو بەری كۆ بوونەوە.

دەگێرنەوە دەڵێن : زۆرێك لە جەنگاوەران و زانایان لە دەوری (كوڕی ئەشعەس ) كۆ بوونەوە ، لە سی وسێ هەزار سوار چاك ئەسپ سوار ، وە سەد هەزار جەنگاوەری پیادەشی لەگەڵدا بوو..!!

ئەوەبوو (كوڕی ئەشعەس ) ئەوەی لەگەڵی دابوو ، چوونە نێو شاری بەصرا ، ئەویش لە وێدا ووتارێكی داو ، وە (كوڕی ئەشعەس ) كۆی وەك خەلیفەی موسلمانان نیشاندا یان راگەیاند ، پاش ئەوە وازی لە خەلیفە (عبدالملك كوڕی مروان ) هێنا بوو ، وە خەڵكیش لە سەر ئەوە پەیمانیان پێدا ، وە پەیمانیشیان پێدا لە سەر پشت كردن و لابردنی جێگرەكەی لە ولاتی عێراق (حجاج كوڕی یوسفی سەقەفی )..!!

وە (كوڕی ئەشعەس ) ئەو ووتەیەی دووبارە دەكردەوە :

دەی ووت: (حجاج) هیچ نیە ، بەلام وەرن با برۆین لە گەل خەلیفەی موسلمانان (عبدالملك كوڕی مروان ) جەنگ و كوشتار بكەین ..؟!

ئەوە بوو هەر هەموویان رازی بوون لە سەر راو بۆچوونەكەی (كوڕی ئەشعەس ) بەوانەش كە لە لەناویدا لە زاناو قورئان خوێنەكانیشەوە ..!!

(ابو مخنف ) دەگێرێتەوە دەلێت : (ابو زوبیری هەمەدانی ) بۆی باس كردم ووتی : لە ناو هاوەلەكانی (كوڕی ئەشعەس ) دابووم ، كاتێك بانگی خەلكی دەكرد و لە لێشاو چوون بەدەم یەوە ، پاشان ووتی : لەم شوێنەوە بپەرینەوە بۆیان ، ئنجا خەلكی بە ئەسپ سواریەكانیانەوە چوون نێو شاروچكەی (دجیل ) لەو شوێنەی كە فەرمانی پێ كردبوون ، سوێند بەخوا سەركەوت ئەوەند خێرا بوو كە هێشتا ئەسپ سواریەكان هەموو نەپەرینەوە تاكو هەلیان كوتایە سەر ئەم دوو فەرماندەیەی (حجاج ) وەكو (مطهر بن حر ) و ( عبداللە كوڕی رمیثة الطائی ) و تێكمان شكاندن رۆژی قوربانی سالی (٨١) كۆچی بوو ، كوشتارێكی یەكجار زۆرمان لە ناو سوپای (حجاج ) كرد ، لەم جەنگە دا (حجاج) شكستی هێنا ، دواتریش ئەم جەنگە ناونرا بە جەنگی (تستر)..!!

پاشان (ابو كعب كوری عبيد كوری سرجس ) به په‌له چووه بۆلای (حجاج) شكستی خه‌لكه‌كه‌ی پێ راگه‌یاند ..!!

(حجاج) ووتی : ئه‌ی خه‌لكینه ، برۆن بۆ به‌صرا بۆ ناو سه‌ربازگه له‌وێ كۆمه‌لانی خه‌لك و جه‌نگاوه‌رو خواردنیشی لێ یه ، چون ئه‌م جێ یه كه ئێمه‌ی لێین سه‌ربازێكیش هه‌لناگرێت..؟! پاشان (حجاج) گه‌رایه‌وه ئه‌سپ سواره‌كانی خه‌لكی عێراق شوێنی كه‌وتن و هه‌ركات كه‌سێكیان بدیتبایه له سوپاكه به‌جێ ماوه یان دواكه‌وتووه ، ئه‌وا یه‌كسه‌ر ده‌یان كوش ..!! (حجاج) ده‌رۆیشت هیچ شتێك سه‌ری لێ نه‌ده‌شێواند تاكو له (الزاويه ) دابه‌زی ، ده‌ستی به‌سه‌ر خواردن ئازووقه‌ی بازرگانه‌كانی گرت ، بردی بۆ جه‌نگاوه‌ره‌كانی خۆی ، ئینجا شاری به‌صرا واز لێ هێنا و ده‌ست به‌رداری بوو بۆ خه‌لكی عێراق ..!!

به‌لام كاربه‌ده‌ستێكی (حجاج) له‌وێ بوو كه ناوی ( حكم كوری ايوب كوری الحكم كوری ابی عقيل ) بوو ، ئئنجا خه‌لكی عێراق هاتن هه‌تا چوونه ، (حجاج) له كاتێكدا تووشی ئه‌و شكه‌سته كوسپ و نه‌هامه‌تی و ده‌رده‌سه‌ریه بوو ، ئینجا گه‌رایه‌وه داوای كرد نامه‌كه‌ی (مهلب ) بۆ بهێنه‌وه ، تا چاوی پیا بخشێنێته‌وه ، دواتر دووباره خوێندیه‌وه ..!!

(حجاج) ووتی : ئافه‌ریم بۆ باوكت ..!! ووتی: چ سه‌ركردیه‌كه ئه‌وه ..!! ووتی : ئه‌و راو بۆ چوونی دروستی بۆ پێشنیار كردین كه‌چی لێ مان وه‌ر نه‌گرد ..!!

ئینجا (حجاج) به سوپاكه‌یه‌وه ده‌ستی به رۆیشتن كرد تا گه‌یشته ( رستقباز ) ئینجا له‌وه‌ی به خۆ به سوپاكه‌ی دابه‌زی و باره‌كه‌ی خست ..!!

پاشان (كوری ئه‌شعه‌س ) له گه‌ل سوپاكه‌ی له (تستر)دابه‌زی و لایدا ، له نێوانیاندا رووبارێك هه‌بوو ، ئه‌وه‌ش ده‌مه‌و ئێواره رۆژی عه‌ره‌فه ی سالی (٨١) كۆچی بوو ، سوپاكه‌ی (حجاج) ی تێكشكاند ..؟! ئه‌م گیرانه‌وه‌ی له (ابو زوبير هه‌ندانی ) باسی كردووه ..!!

ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : له خه‌لكی شام له ناو سوپاكه‌ی (حجاج) دا هه‌زار و پێنچ سه‌دكه‌س كوژران، ئه‌وه‌ی تریشیان شكستیان هێناو هه‌لهاتن ..!!

ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : ئه‌و رۆژه (حجاج) به نزیكه‌ی سه‌د په‌نچا هه‌زار كه‌سی له گه‌لدا بوو ..!!

هەروەها (عبدالرحمن کوری محمدی کوری ئەشعەس ) بە سەر کەوتووی چووە ناو شاری بەصرا ، خەلکە کەش هەر لەوێدا پەیمانیان پێدا و لە سەر جەنگ کردن دژی (حجاج کوری یوسفی سەقەفی ) وە پشت کردن لە (عبدالملك کوری مروان ) ..!!

دەگێڕنەوە دەلێن : جەنگ و کوشتارو شەر کردنی نێوان (حجاج) و (کوری ئەشعەس ) سێ سالی خەیاند ، تەنانەت مانگی محرم و گشت مانگەحەرامکراوەکان جەنگ وکوشتاری یەکتریان کرد..!!

بەلێ سەرتایی جەنگە کە وەك باسمان کرد لە بەرژەوەندی خەلکی عێراق بوون ، بە فەرماندایەتی (کوری ئەشعەس ) بەلام کۆتایی پێ نەهات ، چونکە لە رۆژێکی تردا ، (سفیان کوری ئەبردە ) کە یەکێك بوو لە فەرماندەکانی ولاتی شام ، هەلی کۆتایە لای راستی سوپاکەی (کوری ئەشعەس ) تێکی شکاند ، ژمارەیەکی زۆری جەنگاوەری لێ کوشتن ، وە ژمارەیەکی زۆریش لە قورئان خوێنان (قرءا) کوژران ، کە پیاوی تەقوادار بوون لە ناو سوپاکەی (کوری ئەشعەس ) ..!!

ئینجا (حجاج) سوژدەی شکوری برد ، وەکو خۆشحالی و سوپاگوزاریەك بۆ ئەم سەر کەوتنە پاش ئەوەی کە لە رۆژی پێشوودا خەریك بوو بکوژرێت ..؟!

بەلێ (کوری ئەشعەس ) ئەوەی لە گەلی دابوون هەلهاتن و بەرەو شاری کوفا ، خەلکی بەصراش ئەوانەی پەیمانیان پێدابوو ، یەکێك لە فەرماندەکانی (کوری ئەشعەس ) ناوی ( عبدالرحمن کوری عیاش کوری ربیعە کوری حارسی کوری عبدالمتلب ) بوو ، لە شوێنی خۆی مایەوە بۆ ئەوە بەرنگاری (حجاج) ببێتەوە ، بەو سەربازانەی مابوونەوە لە خەلکی بەصرا ..!!

دەگێڕنەوە دەلێن : بە نزیکەی پێنج شەو گەرمترین جەنگیان بەر پاکرد ، پاشان خۆی گەیاندە کوری (ئەشعەس ) لە شاری کوفا ..!!

(الواقدی ) دەگێرێتەوە دەلێت : کاتێك سوپای (حجاج) و سوپای (کوری ئەشعەس ) بە یەك گەیشتن ، لە (الزاویە ) سوپاکەی (حجاج) جار لەدوای جاردا هەلیان دەکوتایە سەریان ، قورئان خوێنەکان دەیان ووت : لە سەرووی هەموویانیشەوە (جبلە کوری زحر ) دەی ووت : ئەی خەلکینە هەلاتن لە هیچ کەس هێندەی هەلاتنی ئێوە ناشرین نیە کەواتە جەنگ بکەن لە پێناوی ئایین و دونیادا ..!!

دەگێڕنەوە دەڵێن : (الشعبی ) لەگەڵ (کوری ئەشعەس ) بوو ، دەی ووت : جەنگیان لە گەڵ بکەن لە دژی زوڵم و ستەم و زۆرداریەکانیان هەروەها لە دژی ئەوەی لاوازەکان دەچچەوسێنەوە و نوێژەکانیان دەمرێنن ..!!

بەڵێ قورئان خوێنەکان ئەو رۆژە شەرێکی قورسیان کرد ، وە هێرشیان دەکردە سەر سوپاکەی (حجاج ) هەتاکو (جبلی کوری زحر ) قورئان خوێن بوو کوژرا ..!!

ئینجا (حجاج ) هاواری کرد ووتی : ئەی دوژمنانی خوا ئیتر ئەوە گومرا و زۆردارەکەتان کوژرا و پاشان (سفیان کوری ئەبردە ) هەلی کوتایە سەر لای چەپی سوپاکەی (کوری ئەشعەس) تێکی شکاند ..!!

بەڵێ لە دوای سەرنەکەوتنەکەی (کوری ئەشعەس ) لە بەرانبەر (حجاج ) لە شاری بەصرا ، ئینجا (کوری ئەشعەس ) رووی کردە شاری کۆفا ، دواتر خەلکی لە دەوری کۆبوونەوە ، وە پەیمانیان پێدا ، ئەوە بوو سەد هەزار کەس هاتنە پالیەوە ، ئەو سوپایەی کە دووبارە لە شاری کوفا ، (کوری ئەشعەس ) کۆ کردبوویەوە ، ئینجا سوپاکەی لە ناوچەیەك جێگیر کرد کە پێی دەووترا ناوچەی (دیر الجماجم ) ئەم ناوچەیە لە دەرەوەی شاری کوفا بوو ..!!

بەڵێ لەم کات و ساتەدا (حجاج ) نێردراوێکی نارد بۆ لای (عبدالملك کوری مروان ) کە داوای یارمەتی هاریکاری لێ کرد ، بۆ روو بەروو بوونەوەی سوپاکەی (کوری ئەشعەس ) ئەویش هەندێك سەربازانێکی لە خەلکی شام رەوانەکرد ، (حجاج ) سوپایەکی گەورەی بۆ کۆبوویەوە ، هەریەك لەمان خەندەقێکی بەدەوری سەربازگەکەی لێدا ، لە (دیر الجماجم) لە سالی (٨٣) ی کۆچیدا سەرتایی رەبیعی یەکەمەوە ، ئینجا شەر دەستی پێکرد لە نێوانیاندا و سەد رۆژ بەردەوام بوو هەر بۆیە جەنگە کە ناسراوە بە (حرب المائە ) جەنگی سەد رۆژ ..؟!

بەلیٚ هۆکاری جەنگی (دیر الجماجم )ئەمە بووە کە (حجاج) بۆ شەری (عبدالرحمن کوری محمد کوری ئەشعەس ) لە شاری بەصرا وە مەبەستی شاری کوفا ی کرد ، وە لە دێر قورە دابەزی ، (کوری ئەشعەی ) لە شاری کوفا هاتە دەر لە (الجماجم ) خێوەتگەی سەربازی دانا ، (حجاج) ووتی : (کوری ئەشعەس ) لە (الجماجم ) دابەزیوە و من لە دێر قورە ، ئایا نابێت بە خراپی لێك بدەینەوە ..؟! لە لای (کوری ئەشعەی ) خەلکی کوفا و بەصرا و قورئان خوێنەکان و سەربازەکانی سنوور و جەنگاوەرانی ناو سەر بازگەکە کۆبوونەوە ، بۆ جەنگ و کوشتار کردن لەگەل سوپای (حجاج) ، چونکە زۆرینەی خەلکی لە زۆرداری و ستەم زولمی (حجاج) بێزار بوون، دەگێر نەوە دەلێن : ئەوان بە نزیکەی سەد هەزار شەر کەر بوون ..!!

(حجاج) پێش دابەزین لە دێر قورە هێزی یارمەتی یان پشتیوانی بۆ هات ، لە لایەن (عبدالملك کوری مروان ) لە ولاتی شام ، جەنگ و کوشتار دەستی پێکرد ، خەلکی رۆژانە کوشتاری یەکتریان دەکرد و سەنگەرەکانی خۆیان بەهێزو قایم دەکرد ، وە خۆیان لە یەکتری نزیك دەکردەوە ..!!

ئینجا پاشان (عبدالملك کوری مروان ) و خەلکی شام ووتیان : ئەگەر عێراقەیەکان بە لابردنی (حجاج) لە فەرمانرەوایی عێراق رازی بن ، ئەوا فەرمانرەوایەکەی لیٚ دەسێنینەوە ..!! چونکە ئەم کارە ئاسانتر لە جەنگ و کوشتار کردن خوێن رشتن ..!! ئەوە بوو (عبدالملك کوری مروان ) کورەکەی خۆی ، وە (محمد)ی برای لە شاری موصل بوون ، بە سوپایەکی گەورە بۆ لای (حجاج)ی رەوانەکرد ، فەرمانی بە مانەدا پێشنیازی لە سەر کار لابردنی (حجاج کوری یوسفی سەقەفی ) بە خەلکانی عێراق بکەن ..!! وە بەخشەشەکانیان بەوان ببەخشن بە هەمان شێوەی کە بە خەلکی شام دەبەخشرێت ..!! وە (کوری ئەشعەس ) بۆ هەر کام لە شارەکانی عێراق بیەوێت دەتوانێت بروات ، وە تا (عبدالملك کوری مروان) زیندووە ، وە (کوری ئەشعەس ) فەرماندای ئەم شارە بێت کە ئەیەوێت ..!! ووتی: ئەگەر عێراقیەکان بەم فەرمانە رازی بوون ئەوا (حجاج ) لە سەر کار لابدەن ..!! وە (محمدی کوری مروان ) کە برای (عبدالملك کوری مروان ) بوو ، ئەوا ئەو فەرمانرەوایی عێراق بێت ، لە جێگای (حجاج ) ..؟!

به‌لێ (عبدالملك كوری مروان ) فه‌رمانی پیێ كردبوون ، ئه‌گه‌ر عێراقیه‌كان به‌م كاره رازی نه‌بوون..؟! ئه‌وا (حجاج كوری یوسفی سه‌قه‌فی )با بێته فه‌رمانده‌ی كارو باری جه‌نگ بێت ، (محمد كوری مروان ) فه‌رمانڕه‌وایی عێراق بیت ،وه(عبداللهكوری عبدالملك كوری مروان ) كه كوره‌كه‌ی خۆیه‌تی ،گوێرایه‌لی فه‌رمانه‌كانی ئه‌و بێت ...؟!

به‌لیێ هیچ رۆژێك و هیچ كارێك ئه‌وه‌نده دژوار و ناخۆشترو ناهه‌مواتر بنه‌بوو له رۆژی (حجاج ) دا چونكه زۆر ده‌ترسا عێراقیه‌كان به پێشنیازه‌كه‌ی خه‌لیفه (عبدالمك كوری مروان ) رازی بن..!! (عبدالملك كوری مروان ) ئه‌و له سه‌ر كاره‌كه‌ی لاببات ..!! ئه‌وه بوو (حجاج) نامه‌یه‌كی بۆ خه‌لیفه (عبدالملك كوری مروان ) نووسی :

(حجاج) ووتی :سوێند به‌خوا ئه‌گه‌ر له گه‌ل خه‌لكانی عێراق ، رێگه‌ی چاكه كاری بگریته به‌ر من له كاره‌كه‌م دوور بخه‌یته‌وه ، ئه‌وه‌نده‌ی پیێ ناچێت رێگه‌ی خراپه‌كاری له‌گه‌ل تۆ دا ده‌گرنه به‌ر و جه‌نگ و شه‌ری تۆ ده‌كه‌ن ، وه ئه‌م كاره ته‌نها ده‌بێته هۆی بوێری ئه‌م خه‌لكانه ..؟!

(حجاج) ووتی : ئایا نه‌تبینیوه یان نه‌بیستوه كه عێراقیه‌كان چۆن پاشای ئه‌شته‌ریان دژی (عوسمانی كوری عه‌فان ) هه‌لخه‌له‌تاند و هیوا خوازی لابردنی ( سعید كوری عاص ) بوون ..؟!وه كاتێك (سعیدكوری عاص ) یان له سه‌ر كار لابرد ، ته‌نها یه‌ك سالی نه‌خه‌یاند هێرشیان كرده سه‌ر (عوسمان ) خوێنیان رشت ..؟!

(حجاج) ووتی : (ئاسن ته‌نها به ئاسن ده‌توانین بیكوتینه‌وه ..؟!مه‌به‌ستی سته‌م كار به سته‌م كار له ناو ده‌چێت ..!!

به‌لام (عبدالملك كوری مروان ) به (حجاج) رازی نه‌بوو ، چونكه ویستی له سه‌ر بوو ، ئه‌گه‌ر عێراقیه‌كان به پێشنیاره‌كه‌ی رازی بوون ، ئه‌وا (حجاج) له فه‌رمانڕه‌وایه‌تی عێراق له سه‌ر كار لاببات ، به‌لام كاتێك دوو نێردراوه‌كه‌ی ئه‌میری باوه‌رداران ، كه (عبدالله ) ی كوره‌كه‌ی خۆی ، (محمد) ی براكه‌ی له گه‌ل (حجاج ) كۆ بوونه‌وه ، ئه‌وه بوو (عبدالله ) هاته‌ده‌روه ووتی : ئه‌ی خه‌لكی عێراق من كوره‌كه‌ی ئه‌میری باوه‌ردارانم (عبدالملك كوری مروان ) ، ئه‌وا باوكم ئه‌م پێشنیاره‌یه بۆ ئێوه‌ی ده‌كات ..؟! عێراقیه‌كان ووتیان : ئه‌م شه‌و ده‌گه‌رێنه‌وه بۆ شوێنه‌كه‌ی خۆمان له پێشنیاره ده‌كۆلینه‌وه راوێژ له گه‌ل یه‌كتری ده‌كه‌ین ..!!

بەلێ پاشان عێراقیەکان گەرانەوە و پاش راوێژ کردن لە گەل یەکتری دا ..!!

(کوری ئەشعەس ) ووتی : پێشنیارێکی گرانبەهایان بە ئێوە کردووە ئەگەر ئەی خەلکی عێراق پێی رازی بن ، ئەوا دەرفتێکی گونجاو دەبێت بۆ ئێوە لەدەستی مەدەن ..؟!

ووتی :ئەمرۆ ئێوە لەگەل ئەوان بەرانبەرن ، وە ئەگەر لە جەنگی یان شەری (الزاویە ) ستەمیان لە ئێوە کردووە ، ئێوە ئەمرۆ لە جەنگی (شوشتەر) بە سەر ئەوان دا زالن ..؟!

ووتی: بە پێشنیازەکەیان رازی ببن ، چونکە ئێوە بەهێز و رێزدار ، لە بەرانبەر خەلکانێکن کە لە ئێوە کەم کوریەکانی ئەوان دەستنیشان دەکەن ..؟!

ووتی : بەردەوام کەسی بوێر لە لای ئەوان رێزی دەبێت و تا ئەو کاتەی زیندوون ئەگەر بە پێشنیارەکەیان رازی ببن ، ئەوا ئەوان قەرزاری ئێوە دەبن ..؟!

پاشان ئەوە بوو خەلکی لە هەموو لایەکەوە هاواریان کردوو ووتیان : (خوای گەورە ) ئەوانی لە ناو بردووە ، وە ئێستا لە ناو بەدبەختی کەم و کوری دەژین ، ئێمە هێزیکی زۆر و بێ ژمارین کۆتاییەمان لە بەردەست دایە ، نا سوێند بەخوا رازی نابین ..! ! پێشنیاری ئەوەیان کرد دووبارە ئێمە (عبدالملك کوری مروان ) لە سەر کارەکەی لای دەبەین ..!!

بەلێ لە عێراقیەکان ئەوانەی کە هەستانەوە قسەیان کرد ئەمانە بوون : (عبداللە کوری زوابی سولەمی ) و (عمری کوری تیحان ) بوون ، ئەم رووداوە لە (دێر الجماجم ) روویدا ..؟!

ئیتر لەم رۆژەدا (عبداللە کوری عبدالملك ) و (محمدی کوری مروان ) بە (حجاج کوری یوسفی سەقەفی ) ووت : ئەم تۆ سوپاکەت درێژە بە کارەکانت بدە ..!! چونکە فەرمانیان بە وئێمە داوە ئەگەر خەلکی عێراق رازی نەبوون ، ئێمە گوێرایەلی فەرمانەکانی تۆ بین ..!!

لە پاشا (حجاج) ووتی : من بە ئێوەم ووت : مەبەستیان لەم کارە لە سەر کارلا بردنی ئێوەیە واتە : (عبدالملك کوری مروان ) خلافەتی ئەمەویەکان لە ناو ببەن و بی رووخێنن ..؟!

پاشان هەردوو لا بۆ کوشتاری یەکتری خۆیان ئامادەکرد ، ئەوە بوو (حجاج) (عبدالرحن کوری سولەیمی ) کردە فەرماندەی بالی راستی سوپاکەی خۆی ، (عمارەی کوری تەمیمی لەخمی ) کردە فەرماندەی بالی چەپی سوپاکەی خۆی ..!! وە (سفیان کوری ئەبردە) کرد فەرماندەی سوارەکان ، (عبدالله کوری خوبەیبی حەکەمی ) کردە فەرماندەی پیادەکان ...!!

ئەوە بوو هەردوو لا پێشرەویان کرد ، رۆژانە کوشتاری یەکتریان دەکرد ، ئەوە بوو سەردەمێکی ناخۆش لە قات و قیری روویدا لە عێراق شام ، گۆشت دەست نەدەکەوت لە هەر چوار لاوە گەمارۆیی لەسەر بوو ، بەم جۆرەیە لە بەیانی تاکۆ ئێوارە کوشتاری یەکتریان دەکرد ، کاتێك سیٚ دەستە جەنگاوەرکانی (حجاج ) هێرشیان کردە سەر قورئان خوێنەکانی (کوری ئەشعەس ) کە فەرماندەکانی سوپای ئەو بوون ، وەك (جبلەی کوری زحر ) ئەوە بوو لەم جەنگە دا (جبلە ) هاواری کرد ووتی : ئەی (عبدالرحمن کوری لەیلی ) ئەی دەستەی قورئان خوێنەکان ، ئەمرۆ هەلاتن لە هیچ کەسێك بە ئەندازەی هەلاتنی ئێوە قێزەون و ناشرین نیە ..!!

(جبلە کوری زحر) ووتی : من لە (علی کوری ابی تالیب ) — خوا لیٚ رازی بێت — بیستووە کاتێك رووبە رووی خەلکانی شام دەبووینەوە ، ئەو دەی ووت : ئەی خواپەرستەکان هەر کەس ستەمێکی بینی کە بەحەق یان رەوا دەزانرێت و کارێکی قێزەونی بینی کە بانگەشەی بۆ دەکرێت و لەدلی خۆیدا سەرکۆنەی کرد ، رزگاری بووە ، هەر کەس بە شمشێر سەر کۆنەی کرد تا ووتاری خوا سەر کەوێت ووتاری ستەمکاران ریسوا ببێت ، کەسێکە رێگەی راستی بە تەواوی ناسیوە و دلی لە گومان خالیە ، شەر بکەن لەگەل ئەم خەلك خراپەکارە کە مافەکانیان پێشێل کرد ، کارە قێزەونەکانیان برەو پێدا و راستی و دروستیان لە بەر چاو نەگرت و ستەمیان بەرەوا زانی ..؟!

(ابو بوختری ) ووتی : ئەی خەلکینە بۆ ئاین و دونیاتان شەر بکەن ..؟!

(الشعبی ) ووتی : ئەی خەلکینە شەریان لەگەل بکەن و لیٚ یان مەترسن ، چونکە سوێند بەخوا گومان ناکەم لەم جیهانە کەس لەوان ستەمکارترو خراپەکارتر بێت ..؟!

(سعید کوری جبیر ) ووتی :بەدل و بەگیان هێرش بکەنە سەر ئەوان و پشتیان تێمەکەن تا رێزەکانی ئەوان لە ناو ببەن ..؟! تێبینی / ئەمانە لە بەرەی (کوری ئەشعەس ) بوون ..!!

کاتێك (جبله کوری زحر ) کوژرا ، ئەوە بوو یەکێك لە سەربازەکانی (حجاج) کوشتی ، بەناوی ( ولید کوری نەحیتی کەلبی ) بوو ، پاش کوشتی (جبله ) سەری ئەو پەراند ، سەرەکەی ئەوی برد بۆلای (حجاج) مژدەی کوشتنی (جبله)ی پێدا ، پاشان هاوەلەکانی (جبله ) گەرانەوە ئەویان بەکوژاوی بینی ، پەرێشان بوون ، یەکتریان لە کوشتی ئەو دا ئاگادار کردەوە ..!!

ئەوە بوو (ابو بوختری ) ووتی : ئاگادار بوون کوژرانی (جبله ) بەسەر دل و دەروونی ئێوەدا زال نەبێت ، ئەو هاوشێوەی پیاوێك بوو لە ئێوەدا ، کە کاتێك مەرگ هات نەی توانی پێشی پێ بگریت یان دوایی بخات ..؟!

ئینجا خەلکانی شام ئەوانەی پشتیوانی (حجاج)یان دەکرد ، لە ناو خەلکی دا هاواریان کرد ووتیان : ئەی دوژمنانی خوا ئەوا ئێوە لە ناو چوون ، چونکە فەرماندەکەتان کوژراوە ، ئەویش (جبلەی کوری زحر ) بوو ..؟!

ئالەم کات وساتە دا پیاوێك هات و جێگای (جبله ) بگرێتەوە ببێتە فەرماندەیان ، ئەویش ناوی (بێستان کوری مەصقەلە کوری شەیبانی ) بوو ، رۆیشتە لای سوپاکەی (کوری ئەشعەس ) ، پاشان ئەوان زۆر لە هاتنی ئەو شادومان بوون ، ووتیان : پیاوێکی شیا و هات تا جێگەی (جبله ) بگرێتەوە ، ئەو لە شاری (رەی) کە لە خۆرستانەوەیە ، کاتێك گەیشت کوری ئەشعەس ) ئەوی کردە فەرماندەی سوپاکەی خەلکانی رەبیعە ، چونکە پیاوێکی زۆر بوێرو ئازا بوو ..!!

دەگێرنەوە دەلێن : رۆژێك کوشتاری کردن ، رۆیشتە نێو سوپاکەی (حجاج) ، پاشان سێ ئافرەتی بە دیلی گرت و دواتر ئەوانی ئازاد کرد ..!!

(حجاج) ووتی : بەم کارە ئازاد کردنی ئافرەتانی ئێمە ، ئافرەتانی خۆیان ئازاد کرد و پاراست ، چونکە ئەگەر ئەوانیان ئازاد نە دەکرد ئەو کاتەی بەسەر ئەواندا سەردەکەوتم ، ئافرەتەکانیانم بە دیل دگرت ..!!

به‌لێ دوای کوژرانی ئه‌مانه له جه‌نگاوه‌ره‌کانی (کوری ئه‌شعه‌س ) وه‌کو (جبله کوری زحر ) و (سعیدی کوری جوبه‌یر ) و (ابو بوختری تایی ) وه جه‌نگه که به‌رده‌وام بوو بۆ ماوه‌ی سه‌د رۆژ یان سه‌دو سێ رۆژ ، چونکه دابه‌زینی ئه‌وان له (دیر الجماج ) رۆژی سێیه‌می ره‌بیع الاول بوو ، وه سه‌رنه‌که‌وتنی (کوری ئه‌شعه‌س ) له رۆژی چوارده‌ی جه‌مادی بوو ..! ! به‌لام کاتێك شکستیان هێناو ، ئه‌وان له رۆژانی تری زیاتر ده‌جه‌نگین و شه‌ریان ده‌کرد ، ئا له‌م کاته فه‌رمانده‌ی سوپای (حجاج ) که (سفیان کوری ئه‌برەد ) له بالی لای راستی سوپاکه بوو ، هێرشیکی توندی کرد سه‌ر فه‌رمانده‌ی بالی چه‌پی سوپاکه‌ی (کوری ئه‌شعه‌س ) ئه‌وه بوو بێ به‌رگری کردن و شه‌رێکی ئه‌و تۆ بکه‌ن ئه‌وان پاشه که‌شه‌یان کرد ، چونکه به شێوه‌یه‌ك بوو که خه‌لك گومانیان کرد ئه‌و فه‌رمانده‌یه (کوری ئه‌شعه‌س ) که ناوی (ئه‌برەد کوری قوره‌ی ته‌میمی ) په‌یمانی به‌ستووه به درۆ بۆ ئه‌وه‌ی سوپاکه‌ی (کوری ئه‌شعه‌س ) شکست بخوات ..! ! کاتێك بالی چه‌پی سوپاکه‌ی (کوری ئه‌شعه‌س ) پاشه‌کشه‌ی کردو شکستی خوارد ، ئیدی خه‌لکی به کۆلی یه‌کدا هه‌لده‌گه‌ران، ریزه‌کانی جه‌نگاوه‌ره‌کان هه‌لوه‌شانه‌وه تێك چووه ..! !به‌لام دوای ئه‌وه (کوری ئه‌شعه‌س ) ده‌ستی کرد به ووتاردان و هاواری له خه‌لکی کرد ، ووتی : ئه‌خه‌لکینه ئه‌ی به‌نده‌کانی خوا له لای من کۆ ببنه‌وه ، کۆمه‌لێك له‌ده‌وی کۆ بوونه‌وه ، ئینجا (کوری ئه‌شعه‌س ) خۆراگری کرد ، تاکو سوپاکه‌ی (حجاج) له خه‌لکی شام ، لێ نزیك بوونه‌وه ، ئیتر ئه‌وه بوو شه‌ریان کرد له‌گه‌ل سوپاکه‌ی (حجاج) تێکه‌لی یه‌کتری بوون ، پاشان پیاوێك به ناوی (عبدالله کوری یزید کوری مه‌فزه‌لی ئه‌زدی ) هاته لای (کوری ئه‌شعه‌س ) ووتی : پێم باشه دابه‌زی چونکه ده‌ترسم به دیل بگیرێت ، پاشه‌کشه بکه ، چونکه ئه‌گه‌ر هه‌یه‌سوپایه‌کی دیکه بۆ کوشتار کردنی ئه‌مانه ئاماده‌بکه‌یت ، (خوای گه‌وره ) ئه‌مانه له ناو ببات له سه‌ر ده‌ستی تۆ ..! ! ئه‌وه بوو (کوری ئه‌شعه‌س ) له گه‌ل هاوه‌له‌کانی خۆی هه‌لهات به شێوه‌یه‌ك ته‌نانه‌ت ئاوریشیان نه‌دایه‌وه ..؟!

دوتر (حجاج ) چووه ناو شاری کوفا ، وه (محمدی کوری مروان ) که برای (عبدالملك کوری مروان ) بوو بۆ شاری موصل چوویه‌وه ، وه کوره‌که‌ی (عبدالله کوری عبدالملك )چوویه‌وه بۆ ولاتی شام ..؟!

ئینجا (حجاج ) بۆ شاری کوفا چوو، لە ناو شاردا لە خەلکی بەیعەتی وەردەگرت ، لە هیچ کەسێکی بەیعەت وەر نەدەگرت مەگەر ئەوەی پێی دەی ووت : بەکەسەکە شایەتی بدە کە لە ئایین هەلگەراویتەوە ..!! ئەگەر کەسەکە دەی ووت : بەلێ . ئەوا بە ئاسانی بەیعەتی لە گەل دەکرد ، بەلام ئەگەر ئەمەی نەدەووت : ئەینجا فەرمانی دەکرد ملی بپەڕێت و سەری لە لاشەی کەنەوە..؟! پیاوێکیان بردە بەردەمی (حجاج) کەوا ئەم پیاوە لە گەل خەلکان نەبووە واتە : لە سوپاکەی (کوری ئەشعەس ) نەبووە ..؟! بەلام (حجاج) بە پیاوەکەی ووت : تۆ چاوەڕوانی کۆتایی هاتنی شەرەکە بوویت ..؟! تاکو هەر کامە مان سەرکەوێت پێویستی ئەو بیت یان وەك گولە بەرۆژە رووت بسورێنی هەرکام لا سەر کەوت چەپلەی بۆ لێدەی بلێ هاوەلی ئێوەم ..؟! لە پاشان (حجاج) پیێ ووت : ئایا شایەتی دەدەیت کە بێ باوەری ..؟!پیاوەکەش ووتی : پیاوێکی خراپ بم ..؟! من بۆ ماوەی هەشتا سال خوپەرەستیم کردووە ، دواتریش شایەتی بە درۆ بۆ خۆم بدەم ..؟! (حجاج) ووتی : ملت دەپەرێنم و دەت کوژم ..؟! پیاوکەش ووتی : بکوژە ..!! (حجاج ) فەرمانی کرد ملی بپەرێنن و سەری لە لاشەکەی کەنەوە ..؟!

پاشان (حجاج) پیاوێکی بانگ کرد بەناوی (کومەیل کوری زیاد )

(حجاج) پیێ ووت: تۆ بوویت کە رەخنەو سەرکۆنەی ئەمیری باوەرداران (عبدالملك کوری مروان ) دە کرد ..؟! منیش هیوام وابوو بە شێوەیەك بکەویتە بەردەستم ..!!

(کومەیل ) ووتی: لە کام کەسی ئێمە زیاتر تووڕەیت ..؟! بۆ ئەو کە کینەی خەلکانی لە دل گرت یا من کەلێی خۆش بووم ..؟! ئینجا ووتی : ئەی پیاوی سەقەف ، ددانەکانت نیشان مەدە و هاوشێوەی گورگ مەمترسێنە ، چونکە سوێند بە خوا لە ژیانی من زیاتر لە ماوەی دوو جار ئاو خواردنەوەی کەر نەماوەتەوە ..!! تێبینی : چونکە (کەر زۆر خێرا خێرا ئەو دەخواتەوە ) ، (کومەیل ) ووتی : هەر کارێك پێت خۆشە بیکە چونکە شوێنی بەیەك گەیشتنەوەی ئێمە لای (خوای گەورە)یە ..!!

(حجاج) ووتی : بەلگە کان دژی تۆن ..؟!

(کومەیل ) ووتی: بەومەرجەی کە تۆ دادگەر بێت..!! (حجاج) ووتی : ملی بپەرێنن ..!!

## کۆژرانی (کوری ئەشعەس)

بەڵێ ئەوە بوو پاش هەلهانتی (کوری ئەشعەس ) لە جەنگە کە شکست هێنانی ، شوێنکەوتوانی هاوەڵەکانی هەر هەموو پەرتەوازە پەرشوو بلاو بوون ، پاشان (حجاج) فەرمانی کرد کە بانگەوازی بکەن بە ناو شوێنکەوتوان پاشماوەی سوپاکەی (کوری ئەشعەس )دا ، هەر کەسێك بیعەت بداتەوە بە (عبدالملك کوری مروان ) و پارێزراو دەبێت ، هەرکەسیش بچێتە نێو سوپاکەی (قتبیە کوری موسلم ) لە شاری (الری ) بیعەت بداتەوە پارێزراو دەبێت ، ئینجا وەکو باسمان کرد (حجاج) گەرایەوە بۆ شاری کوفا لەوێدا دەستی کرد بە ووتاردان بۆ خەڵکی شاری کوفا ..!!

(حجاج) ووتی: ئەی خەڵکی کوفا یان عێراق بەراستی شەیتان هاتە نێو هەناو سینگ تانەوە ،وە تێکەل بوو لە گەل گۆشت خوێن و دەمارە و گوێ پەل و پۆ و پەری دلتاندا پاشان چووە مێشك و دەمارتانەوە ، ئینجا چووە سەر ترو هێلانەی دانا و هێلکەی کرد ، هێلکە تروکا و بوویە بە بێچوو ، پری کردن و ئاخنینی بە دوو روویی و دووبەرەکی و خراپترین ناکۆکی ، ئێوەش کردتانە رێبەرێك شوێنی کەوتن و رابەرێك گوێرایەلی بوون و فەرمانبە دەستێك پرس و رای پێ دەکەن ، جائیتر نە ئەزموونێك سوودتان پێ دەگەیەنێت و نە رووداوێك دەبێتە پەند بۆتان و نە ئسلامێك دەتانگرێتەوە لە تاوان و نە روونکردنەوە یەك سوودتان پێ دەگەیەنێت ..؟!

(حجاج) ووتی: هەر ئێوە نەبوون کە لە (ئەهواز) هاوەلم بوون ..!! کەچی فێلتان کرد و هەولی غەدرو ناحەقی تاندا و کۆبوونەوە بۆ بێ باوەریی و پێتان وابوو کە (خوای گەورە ) ئاییینەکەی خەلیفەی موسلمانان لە ناو دەبات ..؟!

(حجاج) ووتی : من لە لای خۆمەوە سەرزەنشتم کردن ئێوەش چەند بەرزبوونەو یان لووتان بەرز بوو بەلام بە خێرایی شکستان خوارد تێکشکان ..؟!

(حجاج ) پاشان ووتی : ئەی ڕۆژی (الزاویە ) ... جا چ ڕۆژێك بوو (الزاویە ) ..؟! شكست و ناكۆكی و ڕووخان و بەزین ، وە بێ بەری بوونی (خوای گەورە ) لە ئێوە و پەشیمانی وازهێنانی گەورەكەتان "مەبەستی پێ (كوری ئەشعەس ) بوو " لە ئێوە لە ڕۆژە دا ڕوویدا كە ڕۆژی (دیرالجماجم ) بوو ، بە جۆرێك ئێوەش ویڵو سەرگەردان بوون ، وەك ووشتری سەر لێ شێواو داتاشراو یان داماڵراو لە پێستەكەی خۆی ..؟!

(حجاج) ووتی : ئیتر ئەو كاتەی كە شمشێر قەپی لێگرتن و تیر سینگی كون كردن ، مرۆڤێكتان برا لە براكەی نەدەپرسی ، گەورەكەتان ئاوری بەلای شوێن كەوتەوە كانی یان نەوەكانی نەدەدایەوە دلی بۆ نەد سووتان " دووبارە مەبەستی (كوری ئەشعەس ) بوو" ..؟! پاشان ووتی : ڕۆژی (دیر الجمام) هاتەكایەوە ئای چ ڕۆژێك بوو ..؟! لەم ڕۆژە دا جەنگ و كوشتار كردن بەر پابوو .. لەو ڕۆژەدا..؟!

بضرب يزيل الهام عن مقيله ---------------- ويذهل الخليل عن خليله .

واتە: بە لێدان سەرەكان لە گەردن جیادەكرانەوە ---- هاوڕێ لە هاوڕێكەی خۆی هەلدەهات.

(حجاج) ووتی : ئەی خەلكی ئەهلی خراپەكاری دوای خراپەكاری و ناپاكی لە دوای ناپاكی ، بێ باری لە دوای بێ باری ..! ! گەر قیت بوونەوە لە شوێنی خۆتان دەبنە داگیركار و ناپاكی دەكەن ، ئەگەر لە ئاشتی بیمەدابوو ئاژاوە دەنێنەوە ، ئەگەریش ترسان دوو ڕووی دەكەن ، ن باسی چاكەیەك دەكەن ، نە سوپاسی نیعمەتێك دەكەن ، هەر دەستبرێك سووكایەتی پێكردبن یان فریودەرێك فێلی لێكرد بن یان هەر ستەمكارێك پشتی نەگرتبن یان هەر فێلبازێك باوەشی بۆ نە گرتبنەوە ئێوە شوێنی نەوە كەو توونە و پەناتان داوە و پشتیوانیتان لێكردووە باوەشتان بۆ كردۆتەوە ..؟! "تێبینی دیسانەوە مەبەستی ئەم وصفە خراپانە (كوری ئەشعەس ) بووە "..! !

ئینجا (حجاج) ووتی : ئەی خەلكی كوفا یان عێراق هەر یاخیەك ئاژاوەی نابێتەوە یان هەر كێشەیەك هاتوهاواركەرێك هاوارێكی كردبێت یان هەر كەس بایەكی لە سكی خۆی دەركردبێ ئێوە بوونەتە پشتیوان و شوێنكەوتووی ..؟! ئەی خەلكی عێراق ئایا لە پەندەكان پەند وەرناگرن..؟!ئایا مل پەرین یان سەر پەراندن ناتان وستێنێت ..؟!ئایا ڕووداوەكان ئێوە ناترسێنێت ..؟!

بەلێ وەکو باسمان کرد (حجاج) جارێکی تریش بەیعەتی لە خەلکی عێراق وەرگرتەوە بۆ خەلیفەی موسلمانان (عبدالملك کوری مروان ) ، هەر وەکو مێژوو نوسانی باسی دەکەن دەگێرنەوە دەلێن: (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی ) لە کوشتار کردن لە خەلکی عێراق و سوپاکەی (کوری ئەشعەس ) بە نزیکەی سەدو سی هەزاری کوشت ..؟!

بەلام (کوری ئەشعەس ) هەلهات روویشتە لای پاشا سجستان کە ناوی (روتبیل) بوو ، پەنای بردە بۆ لای ئەم پاشایە ، هەر وەکو پێش تریش پەیمانی پێدا بوو جەنگ و شەر نەکات لە گەلی دا ، ئەگەر سەر کەوت بەسەر دەولەتی ئەمەویەکان یان بەسەر (حجاج) ، بەلام ئەگەر شکستی هێناو سەر نەکەوت ئەوا ، ئەم پاشایە پەنای بدات لە لای خۆی بیحەوێنێتەوە پەنای بدات ، پاشان (روتبیل ) بەم جۆرە بۆ ماوەیەك وەفادار بوو بۆی پەنای دا ، بەلام (حجاج) بەردەوام نامەی بۆ (روتبیل ) دەنارد داوای لێدەکرد (کوری ئەشعەس ) رادەست بکاتەوە ..!! بەلام (حجاج) بەردەوام هەرەشەی لە (روتبیل ) دەکرد بەوەی دەبێت (کوری ئەشعەس ) رادەست بکات ، بۆ کۆتا جار هەرەشەیەکی توندی لێکرد ، (حجاج) پێی ووت : " سوێند بەخوایەی کە هیچ نیە جگە لە زاتی (الله) ئەگەر رادەستی نەکەیت یەك ملیۆن لە جەنگاوەرەکانمان دەنێرمە سەرت کوشتاری تۆ خەلکەکەی تۆ بکەن " بەلام دەگێرنەوە دەلێن : سەرتا (حجاج) بە فەرمانداریەتی ( عمارە کوری تمیم اللخمی ) بە سی هەزار سوارچاکەوە لە سوار چاکەکانی خەلکی شام ئامادەکرد بۆ کوشتار و جەنگ کردن لەگەل پاشای (روتبیل ) ، ئەگەر (کوری ئەشعەس ) ئەوانەی لەگەلیدا رادەستی نەکات ، ئەوا کوشتارێکی خوێناوی بەرپا دەکەن ..؟! هەر بۆیە پاشا (روتبیل ) پرسی بە پیاوەگەورەکان و راوێژکارەکان و فەرماندەکانی سوپای خۆی کرد ..؟! ئەوانیش پێشنیاری رادەست کردنەوەی (کوری ئەشعەس) یان بۆ کرد ..!! پێش ئەوەی (حجاج ) لە شوێنی خۆی بێتە دەرەوە ، ئینجا پاشا (روتبیل ) نێردراوی بۆلای (حجاج ) رەوانەکرد بەومەرجەی کە بۆ ماوەی دەسال جەنگ و شەری لەگەلدا نەکات ..؟!

بەلێ (حجاج) بەداواکەی (روتبیل ) رازی بوو ، بەلێ ئەوکاتە بوو ، بەلێ ئەو کاتە بوو هۆکاری رادەستکردنەوەی (کوری ئەشعەس ) ، خیانەت و ناپاکی کردنی (روتبیل ) لە (کوری ئەشعەس ) دەگێرنەوە دەلێن : (روتبیل ) فەرمانی کرد بە دارو دەستەکەی کە لە ملی (کوری ئەشعەس ) بدەن و سەری لە لاشەی جیابکەنەوە سەرکەی بەدیاری پێشکەش بە (حجاج ) بکات ..!!

هەندێکی تریش دەگێرنەوە دەلێن : (کوری ئەشعەس ) لە لای (روتبیل) تووشی نەخۆشی سیل بووە ، پاشان ئەمە هۆکاری مردنەکەی بووە ، واتە : بە نەخۆشی سیل مردووە ، کاتێك مردووە (روتبیل) سەری لە لاشەکەی کردۆتەوە ناردویەتی بە دیاری پێشکەشی (حجاج )ی کردووە ..!!

بەلام ئەوەی زیاتر کۆدەنگی زانایانی مێژووی لەسەر وەکو ئەمانە (ابن کثیر ) و (ابن جریر ) بێجگە لەمانەش دەلێن : (روتبیل ) سی کەس لە هاوەلانی (کوری ئەشعەس ) و بە خۆی و هەر هەموویان کۆت و زنجیر دەکات لە گەل نێردراوەکەی (حجاج ) دەنێریت بۆ (حجاج ) ..!!

هەندێکی تریش دەلێن : لە رێگا دا دەرۆیشت گەیشتنە شوێنێك پێ دەووترا (الرجج ) لەوێدا ئەوانە هەموو کۆت زنجیر کرا بوون ، بەلام (کوری ئەشعەس ) لە گەل پیاوێك دا بەیەکەوە بەسترابوون ، ئەویش لەگەل پیاوەکە چوونە سەر بانی خانوویەك بەیەکەوە ، هەردووکیان خۆیان هەلدایە خوارەوە بەیەکەوە مردن ..؟!

دەگێرنەوە دەلێن : ئینجا سەری خۆی و ئەو هاوەلانەی لە گەلیاندا بووم بردیان بۆ (حجاج) ، پاشان کە (حجاج ) کەللە سەرەکانی بینی فەرمانی کرد خەلکیش بیان بینن ..!!

دواتر ئەم کەللە سەرانە نێردران بۆ ولاتی مصر کە (عبدالعزیزی کوری مروان ) کە برای (عبدالملك کوری مروان ) بوو ، ئەوە بوو لەوێدا سەری (کوری ئەشعەس )یان هەلواسی خەلکی دەهاتن سەریان دەکرد ، سەرەکانیان لە چووە ولاتی مصر دا ، بەلام لاشەکەیان لە (الرجج) بوو، هەندێك لە شاعیرەکانیش لەم بارەیە ووتویانە :

هيهات موضع جثة من رأسها ------------- رأس بمصر وجثة بالرجج

واتە: چەند دوورە شوێنی لاشە لە کەللە سەرەوە کەللە لە میصر و لاشە لە (الرجج).

## بانگ کردنی هاوەڵانی (کوری ئەشعەس) بۆ لای (حجاج)

ئەوە بوو پاش ئەوەی ڕاپەڕینەکەی (کوری ئەشعەس ) کۆتایی پێهات ، هاوەڵەکانی هەر هەموو پەرشوو بلاو بوون ئاوارەو سەرگەردان بوون ، ئیتر ئەوەبوو (حجاج) زۆرێکی لێ کوشتن زۆرێکی زیندانی کردو ئازاری دەدان بە لێدان ..!!

ئەوە بوو کە دواتر (محمدی کوری سعد کوری ئەبی وەقاص ) ی کە ئەیەکێك بوو لە شوێن کەوتوان بانگی کرد ..!!

(حجاج) پێ ووت : ئەی سێبەری شەیتان ..!! ئەی گومڕاترین و یاخیترینی خەلکان ..!! لە بەیعەت لەگەڵ (یزید کوری معاویە ) پاشگەز بوویتەوە ، خۆت دەکەیتە هاوشێوەی کەسان وەکو (حسین کوری علی ) و (عبدالله کوری عمر ) ..؟!

ئینجا دواتر لێ یدا بە لێدان ، (حجاج) بەردەوام بوو بە قامچی گورز لە سەری و لە ڕوخساری دەدا ..!! پاشان پیاوێك بەناوی ( عمری کوری موسا) ووتی : ئەی فەرماندە " مەبەستی (حجاج) بوو " ووتی: ئەم ڕووداوە فیتنەیەك و ئاژاوەیەك بوو ، خراپ و چاکە کاری گرتەوە ، وە ئێمەش کەو تووینە ناوی و ئێستا (خوای گەورە ) دەستی تۆی بەسەر ئێمەدا زاڵ کردووە یان ئاوەلا کردووە ، ووتی : ئەگەر لێمان خۆش بیت ، ئەوا لە چاکەی خۆتە و لە پێشی تۆ نیشان دەدات ، وە ئەگەر سزمان بدەیت دەستەیەك ستەمکارت سزا داوە ..؟!

(حجاج) ووتی: ئەوەی کە چاکەکار و خراپەکاری گرتۆتەوە ، لە درۆکانی تۆیە ..؟!

(حجاج) ووتی: ئێوە خراپەکارن نەك چاکەکار ، بەلکو ئەم ئاژاوەیە هەموو خراپەکارانی گرتۆتەوە، وە چاکەکار لەوە ڕزگاری بوو..؟! بەلام ئەوەی بەیعەت بدات و دان بە گوناهەکانی دابنێت ، ئەگەری هەیە سودی تۆی تیا بێت ..؟!

پاشان لەوێد خەلکی هیوایان دەخواست کە ڕزگاری بێت ، بەلام (حجاج) فەرمانی سەر برینی ئەوی دەرکرد ..!!

دواتریش (حجاج) بانگی (هیلقام کوری نوعیمی ) کرد ..!!

(حجاج) لێی پرسی : گومان بکەین کە (کوری ئەشعەس ) بە ئاوات یان خواستەکەی خۆی دەگەیشت ، وە تۆ چ هیوایەکت پێ بوو ..؟!

(هیلقام ) ووتی: هیوا دارو بووم سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و من بکاتە فەرمانرەوای ولاتی عێراق ، بەهەمان شێوە کە (عبدالملك کوری مروان ) تۆی کردۆتە فەرمانرەوایی ئەم ناوچەیە ..؟!

ئینجا (حجاج ) فەرمانی کوشتنی ئەویشی دەرکردە ..!!

دواتر (حجاج) بانگی (عبدالله کوری عامر ) کرد ..!!

کاتێك رۆیشتەلای (حجاج) ووتی : ئەگەر رزگارت بێت ، ئەوا چاوت بەبەهەشت ناکەوێت ..؟!

(عبدالله کوری عامر ) ووتی : خوا پاداشتی (کوری موهەلیب ) بداتەوە ..!!

(حجاج) ووتی : (کوری موهەلیب ) چی کردووە ..؟!

(عبدالله کوری عامر ) ووتی : کە ئەم پارچە شعرەی ووت :

لانه كاس في اطلاق اسرية ---------- وفاد نحوك في اغلالها مضرا

وفي بقومك ورد الموت اسرتة ------- وكان قومك ادنى عنده خطرا

واتە: ئەو لە ئازاد کردنی بنەماڵەکەی خۆی پێش دەستی کرد و و خەلکانی موزێری ، دەست و پێ بەستراو بۆ لای تۆ رەوانە کرد. خەلکەکەی تۆی بۆ سەرچاوەی مەرگ و نەمان رەوانەکرد و خەلکەکەی خۆی رزگار کرد ، خەلکەکەی تۆ لای ئەو بەهایان کەمتر بوو ..!!

ئینجا (حجاج) سەری داخست وەك بلێ ئەو وتەیە کاریگەری لە سەر هەبوو ..!!

(حجاج) پێ ووت : تۆ چ کارێکت بەوە هەیە ..؟! پاشان فەرمانی کرد ملی بپەرێنن ..؟!

دەلێن : ووتارەکەی لەدلی (حجاج) مایەوە تا سەرئەنجام(یزید) لە خۆرستان لابرد و زیندانی کرد.

ئینجا (حجاج) کەسێکی دی بانگ کرد بەناوی (فیروز حصین) کە یەکێك بوو لە بنەمالانەی کە شوێن کەوتووی (کوری ئەشعەس )بوو ، کاتێك دەست گیر کرا بانگ کرا بۆ لای (حجاج) ..!!

(حجاج) پیٚ ووت : ئەی باوکی عوسمان ، بەخوا تۆ گۆشت لە گۆشتی ئەوان و خوێنت لەخوێنی ئەوان نیە ..؟! مەبەستی (کوری ئەشعەس ) و شوێنکەوتووەکانی بوو ..!!

ئینجا (فیروز) وەلامی دایەوە ووتی : فتنەو ئاشوب و ئاژاوەیەك بوو خەلکی کوێر کرد و ئێمە لە ناویدابووین ..؟!

(حجاج) ووتی : ئەندازەی سامانەکەت بۆ من بنووسە ..؟!

(فیروز) ووتی : هەزار هەزار و دوو هەزار هەزار (سیٚ ملیۆن دینار یان دەرهەم ، سامانێکی زۆری باس کرد ..!!

(حجاج) ووتی : ئەم سامانە لە کوێیە ..؟!

(فیروز) ووتی : لە لای منە ..!!

(حجاج) ووتی: بیدە بەمن ..؟!

(فیروز) ووتی : خوێنم پارێزراو دەبێت ..؟!

(حجاج) ووتی: سوێند بەخوا لێت وەردەگرم دواتریش خوێنت دەرێژم و ملت دەپەرێنم ..؟!

(فیروز ) ووتی: سوێند بەخوا ، خوێنم و سامانەکەم لە یەك شوێندا کۆناکەمەوە ..؟!

(حجاج) فەرمانی دەرکرد ئەویان دوور خستەوە ..!!

دواتریش (حجاج) فەرمانی کرد بیهێنەوە هێنایانەوە لای (حجاج) ..!!

(حجاج) پێ ووت : تۆ ئه‌ی (فیروز) ، له‌سه‌ر که‌لله سه‌ری (حجاج) سه‌د هه‌زار ده‌رهه‌مت ده‌دا ..؟!

(فیروز) ووتی : ئێ وام کرد ..!!

(حجاج) ووتی: ئێ منیش ته‌ختت ده‌که‌م و هه‌لده‌کوتمه سه‌ر سه‌رت ..!!

ئینجا (حجاج) فه‌رمانی ده‌رکرد به ئه‌شکه‌نجه‌دانی ..!!

ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : له کاتی ئه‌شکه‌نجه دانی (فیروز) قامیشی سه‌رقه‌لشاوی فارسیان به جه‌سته‌یدا ده‌هێنا تا ببورێته‌وه یان برینداریان ده‌کرد دواتریش سه‌رکه‌یان پێدا ده‌کرد ..!! به‌لام (فیروز ) کاتی زانی واله مه‌رگ نزیك ده‌بێته‌وه، به‌و که‌سه‌ی ووت : که ئه‌شکه‌نجه‌ی ده‌دا ، ووتی : خه‌لکی گومان ده‌که‌ن که من کوژراوم ، به‌لام سامانێکی زۆرم له لای خه‌لك هه‌یه که هیچ کات راده‌ستی ئێوه‌ی ناکه‌نه‌وه که من بمرم ، جا به (حجاج) بلێن : که‌من دوا له خه‌لك ده‌که‌م سامانه‌که‌م بۆ ئێوه بێت و خه‌لکی سامانه‌که بگه‌رێنه‌وه ، ئه‌وانیش (حجاج) یان له‌م قسانه‌ی (فیروز) ئاگادار کرده‌وه ، ئه‌ویش فه‌رمانیدا که باقسه له‌گه‌ل خه‌لك بکات ، بۆئه‌وه‌ی سامانه‌که‌ی بگه‌رێته‌وه ، ئینجا(فیروز) یان برده ده‌ره‌وه‌ی ده‌روازه‌ی شار ، ئه‌ویش هاواری کرد ، ووتی: ئه‌ی خه‌لکینه هه‌ر که‌سێك من ده‌ناسێت ، بمناسێت و هه‌ر که‌س نامناسێت بزانێت که‌من (فیرز) م ، من سامانم له ده‌ستی که‌سانێك دایه ، هه‌ر که‌س شتێکی منه لایه ، ئه‌وا بۆ خۆی بێت نه‌گه‌رێنێته‌وه ، چونکه له قه‌رزه‌که‌م که له لای هه‌ر که‌سێکه خۆش بووم و نابێت یه‌ك ده‌رهه‌می به‌که‌س بدات ، وه ئه‌و خه‌لکانه‌ی لێره‌ن ئه‌م په‌یامه‌ی من به‌که‌سانی تریش بگه‌یه‌نن ، ئینجا (حجاج) زۆر تووره بوو له‌م وتانه‌ی فه‌رمانی دا یه‌کسه‌ر ملی بپه‌رێنن ، ئینجا سه‌ریان په‌راند ..؟!

ئینجا (حجاج) بانگی (ئەعشا همەندانی) کرد ، که بەر پرسی راگەیاندنی (کوری ئەشعەس ) بوو ، ئەو له جەنگە کان شعری هۆنراوەی دەووتەوە خەلکی له دژی (حجاج) و دەولەتی ئەمەویەکان هاندەدا بۆ جەنگ و کوشتار کردن له گەلیاندا ، ئەویش ناوی ( ئەعشا همەدانی ) شاعیر ، چونکە رێبەرێك بوو بۆ هاندان بەرزکردنەوە گیانی مەعنەوی جەنگاوەرەکانی (کوری ئەشعەس ) ، چونکە بەخراپی باسی (حجاج) خەلافەتی ئەمەویەکانی دەکرد ..؟!

(حجاج) پیێ ووت : ئەی دوژمنی خوا ، ئەو قەسیدەسە یان هۆنراوەیە بۆ من بخوێنەوە کەتیا دا ووتبووت ، له نێوان (الاشج و بین قیس باذج) ئەویش ووتی : ئەم هۆنراوەیە دەخوێنمەو که تایبەت بە تۆم نووسیومە ..؟!

(حجاج) ووتی : بخوێنەرەوە ... ئەویش ووتی :

ابى الله ان يتمم نورة ------------ ويطفى نار الفاسقين فتخمدا

ويظهر أهل الحق فى كل موطن -------- ويعدل وقع السيف من كان اصيدا

وينزل ذلا بالعراق و أهله ---------- لما نقضوا العهد الوثيق الوكدا

وما احدثوا من بدعة وعظيمة--------- من القول لم تصعد الى الله مصعدا

وما نكثوا من بيعة بعد بيعة --------- اذ ضمنوها اليوم خاسوا بها غدا

وجبنا حشاه ربهم في قلوبهم ---------فما يقربون الناس الا تهددا

فلا صدق وفي قول ولا صبر عندهم -----ولكن فخرا فيهم و تزيدا

فكيف رايت الله فرق جمعهم ---------ومزقهم عرض البلاد و شردا

فقتلاهم قتلى ضلال و فتنة --------- وجيشهم امسى ذليلا مطردا

ولما زحفنا لابن يوسف غدوة -------- وابراق منة العارضان و ارعدا

قطعنا اليه الخندقين وانما --------- قطعنا و افضينا الى الموت مرصدا

فكافحنا الحجاج دون صفوفنا ------------ كفاحا ولم يضرب لذالك موعدا

بصف كان الموت في حجزاتهم ------------ اذا ماتجلى بيضه و توقدا

دلفنا اليه في صفوف كانها -------------- جبال شروري او نعاف فشهمدا

فمات لبث الحجاج ان اسل الا رايته ---------معانا ملقى للفتوح معودا

و ان ابن عباس لفى مرجحنة ----------- نشبهها قطها من الليل أسودا

فما شرعوا رمحا ولا جردوا طبى--------- ألا انما لاقى الجبان فجردها

و كرت علينا خيل سفيان كرة ---------- بفرسانها والسمهرى مقصدا

وسفيان يهديها كان لواءها ----------- من الطعن سند بات بالصبغ مجسدا

كهول و مرد قضاعة حوله ----------- مساعير ابطال اذا النكس عردا

اذا قال شدوا شدة حملوا معا ----------فانهل خرصان الرماح اوردا

جنود امير المومنين و خيله ---------- وسلطانه امسى عزيزا مويدا

فيهنى امير المومنين ظهوره ---------- على امة كانوا سعاة و حسدا

نزوا يشتكون البغى من امرائهم --------وكانوا هم ابغى البغاة و اعتدا

وجدنا بني مروان خير أئمة ---------- وافضل هذا الناس حلما و سوددا

وخير قريش في قريش اورمة----------وأكرمهم ألا النبي محمدا

اذا ما تدبرنا عواقب امره ----------- وجدنا امير المومنين مسددا

سيغلب قوما حاربوا لله جهرة ---------مريضا و من والى النفاق والحدا

كذالك يضل الله من كان قبله --------- وان كايدوه كان أقوى و اكيدا

وقد تركوا الاهلين و المال خلفهم ---------- وبيضا عليهن الجلابيب خردا

يناديهم مستعبرات اليهم ------------- ويذرين دمعا في الخدود واثمدا

أنكثا وعصيانا وغدرا وذلة ------------ أهان الاله من أهان و ابعدا

لقد شام المصرين فرخ محمد ---------- بحق وما لاقى من الطير اسعدا

كما شام الله النجير و اهله ------------ بجد له قد كان اشقى و انكدا

مانای ئه‌م هۆنراوه‌یه ئه‌مه‌یه به کوردیه که‌ی :

(خوای گه‌وره) خوازیاری هیچ کارێك نیه و هه‌ر کارێك ئه‌نجام بدات مه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی زۆرینه‌ی تیشکی خۆی بلاو بکاته‌وه و رووناکی خۆی به هه‌موو شوێنێك بگه‌یێنێت و رووناکی خراپه‌کاران بکوژێنێته‌وه به شێوه‌یه‌ك خۆی دابمرکێته‌وه ..!! ئه‌وانه‌ی به‌دوای راستی و دروستی ده‌گه‌رێن ، له هه‌موو شوێنێك سه‌ر که‌وتویان ده‌کات و به شمشێر سه‌ری یاخیان ده‌په‌رێنێت ..!! وه ریسوایی به‌سه‌ر خه‌لکانی عێراق داباراند له‌به‌ر ئه‌وه‌ی په‌یمانه به هێزه‌کانی خۆیان شکاند ..!! چونکه کاری قێزه‌ونی زۆریان ئه‌نجامدا و یاخی بوون و هه‌لیت و په‌لیتیان هێنایه سه‌ر زومان که هیچ کامیان رێگه‌ی ئاسمانی نه‌گرته‌به‌ر ، به‌یعه‌ته‌کانیان یه‌ك له‌دوای یه‌ك شکاند ، ئه‌گه‌ر ئه‌مرۆ به‌یعه‌تێکیان پشت رای ده‌کرده‌وه ، به‌یانی پێشێلیان ده‌کرد و ترسێك که (خوای گه‌وره) دلی ئه‌وانی پیٚ لێوان لێو کرد به‌شێوه‌یه‌ك ته‌نیا به ترسه‌وه له که‌سێك نزیك ده‌که‌نه‌وه ..!! نه ووتاره‌کانیان راستی تیا ده‌بینرێت و نه کار ه‌کانیاندا خۆراگرن ، ئه‌وه‌ی هه‌یانه ، ته‌نیا شانازی کردنه به خۆ و زیاد ویستن ..!! ئێستا ببینیت (خوای گه‌وره) چۆن ئه‌وانی پرژو بلاو کرده‌وه و ئه‌وانی له‌ناو برد و بۆ هه‌موو سه‌ر زه‌مینه‌کان دووریخستنه‌وه ..!! کوژراوه‌کانی ئه‌وان کوژراوی گومرایی و ئاژاوه‌ن و سوپاکه‌ی ئه‌ون نیشانه‌یه‌که بۆ ریسوایی و لاوازی ..!! کاتێك به‌ره‌به‌یان بۆ لای (کوری یوسف ) پێشره‌ویمان ده‌ست پێکرد و دوو کولمی سور بوونه‌و و هه‌وره بروسکه‌یان لیٚ به‌رزبوویه‌وه ، دوو سه‌نگه‌ره‌که‌متن بۆ لای ئه‌و بری ، نه‌رۆشتینه لای ئه‌و به‌لکو به‌ره‌و مه‌رگێك که له‌سه‌ر رێگا دانیشتبوو ، به‌رێکه‌وتین ..!!

حجاج له‌ناو ریزه‌كانمان شه‌ری له‌گه‌ل ده‌سته‌یه‌ك كه وه‌ك بلێی نیشانی مه‌رگیان له‌سه‌ر ئالاكانیان به ستبوو و ئه‌مه له كاتێكدا بوو كلاوی ئاسنینی ئه‌و وه‌ك هه‌تاو ده‌ستی به‌دره‌وشانه‌وه كرد ..!!

هاوریێ له‌گه‌ل ریزه‌كان پێشره‌ویمان كرد كه له خۆراگریدا هاوشێوه‌ی كێوه‌كانی شه‌رو یا نێغاف یا شه‌همه‌دا بوون ..!! ئه‌وه‌نده‌ی نه‌خایاند حجاج تیغه تیژه‌كه‌ی خۆی ده‌ركێشا به شێوه‌یه‌ك ریزه‌كانی ئێمه‌ی تێكشكان و هه‌لاتن ..!! هه‌ر جار كه حجاج هێرشی برد ، ئه‌وم به پیاوێك بینی كه مه‌به‌ستێكی گه‌وره‌ی هه‌یه ، ئه‌ندێشه‌یه‌كی به هێز و دلێك بۆ سه‌ر كه‌وتنێكی هه‌میشه‌یی ..!!

كوری عباس هاوریێ له‌گه‌ل سووپایه‌كی شه‌ر كه‌ری سه‌ر كوتكه‌ر گه‌یشت كه ته‌نها ده‌توانین به به‌شێك له شه‌وی تاریكی بشوبهێنین ..!! نه رمیان به‌رز كرده‌وه و نه‌شمشێر یان له كالان ده‌ركێشا ..!! پیاوی لاواز چاوی پێیكه‌وت و گیانی له جه‌سته‌ی سه‌ند ..!! سوپاكه‌ی سفیان هێرشیان كرده سه‌ر ئێمه و سواره‌كانی ئه‌وان به شمشێره ده‌ركێشراوه‌كان روویان له ئێمه كرد..!! سفیان رێبه‌ری ئه‌وانی ده‌كرد وه‌ك بلێی ئالاكه‌ی ئه‌و زۆری خوێن رشتن ، قوماشێكی ریێ رێی یه‌مانی بوو كه به‌ره‌نگی شین تێكه‌ل كرابوو ..!پیره‌كان و گه‌نجه‌كانی خوزاعه له ده‌وری ئه‌و بوو ، پاله‌وانانی شه‌ر بوون ، كاتێك پیاوی لاواز هه‌لبێت ..!! كاتێك ده‌لێت: یالا ، هه‌موو پێكه‌وه هێرش به‌رن و رمه‌كان له خوێنی خراپه‌كاران تێراو بكه‌ن ، نۆشی گیانی سه‌روه‌ری باورداران بێت ده‌ركه‌وتنی و له سته‌می فه‌رمانره‌واكه‌یان هاواریان به‌رز كرده‌وه به‌لام خۆیان له‌وان سته‌مكار تر بوو ..!! ئێمه كوره‌كانی (مروان)مان به باشترین رێبه‌ر بینی كه له رونگه‌ی خۆراگری و سه‌روه‌ری ، له هه‌موو خه‌لكان له پێشترن ..!!!!باشترینی قوره‌یش له روانگه‌ی نه‌ژاد و بنه‌ماله بوون و له پێشترینی ئه‌وان ..!!جگه له پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئێمه محمد كه كه‌سی شیاو نیه بۆ به‌رابه‌ر كردن له‌گه‌ل ئه‌و..!! كاتێك له ئه‌نجامی كاری سه‌روه‌ری باوه‌رداران بروانین، ئه‌و به پیاوێكی به‌برشت ده‌بینین ..!! به‌زوویی تێكده‌شكێن ئه‌وانه‌ی به ئاشكرا شه‌ری (خوای گه‌وره) یان كرد و ئه‌گه‌ر فێل له گه‌ل ئه‌و بكه‌ن ، ئه‌و به به‌هێزتر و چاره‌ساوتر ده‌بینن ..!!

بەمشێوەیە كە (خوای گەورە) كەسێك كە دلی نەخۆش بێت و دوو ڕوویی و بێ ئایینی بكاتە پیشە، گومرایی دەكات ..!! ئەوان كەسان و سامانەكانی خۆیان و ژنانی جەستە سپی كە جل و بەرگی بەزێر چنراو و شەرمەزاریان لە بەرداربوو ، بە جێهێشت ..!! ئەوانی بان كرد وئەوان فرمێسكیان بەسەر كولمە ناسكەكانی خۆیاندا دەباراند ..!! دەیان ووت : ئایا پەیمان شكێنی و یاخیگەری و فریوكاری ؟ ئەوكەسەی ئایینی (خوای گەورە) ریسوا بكات و پشت گوێی بخات ، (خوای گەورە ) ریسوایی دەكات و لەناوی دەبات ..!! مناله گەنجەكەی محمد هەردوو شارەكەی ریسوا و زەلیل كرد چونكە ئەوەی كرد لە ڕووی راستی و دروستی بوو ، وە بالندەی بەخت بوو ئەوەی بەسەر سەریەوە سورا ..!! بە هەمان شێوە كە (خوای گەورە) نوجویر و بنەمالەكەی ریسوا كرد و ئەمە لە زیانی باوەگەورەیی ئەو بوو كە بە شێوەیەكی بەدبەخت و چارەرەش ژیا ..!!

بەلێ ئەم هۆنراوەكەی (ئەعشا همەدانی ) بوو بەم شێوەیە بوو :

ئینجا خەلكانی زۆر لەویدا بوون ووتیان :قسەیەكی جوانی كرد یان هۆنراوەیەكی جوانی خوێندوە، (خوای گەورە ) تەمەنی سەر وەرمان درێژ بكات ، مەبەستیان (عبدالملك كوری مروان ) بوو..!!

پاشان (حجاج) ووتی : نا نەخێر . چاكی نەووت ، ئێوە نازانن چ مەبەستێكی لە دڵ دایە ..!! دواتر (حجاج) ووتی : بە (ئەعشا همەدانی ) ئەی دوژمنی خوا ، سوێند بە خوا بەم هۆنراوەیەت یان شیعرەت دەست خۆشیت لێ ناكەم ..؟! تۆ ئەمەت لە تاو ئازار و ئەشكەنجە هێناوەتە سەر زمان ، چونكە ئەو سەر نەكەوت ، مەبەستی ئەوەت كرد هاوەلانت هان بدەیت ..!! لەبەر ئەوە بوو كە داوامان كرد ئەو هۆنراوەیە یان قسیدەیە بخوێنیتەوە كە دەلێت : ( بین الاشج وبین قیس باذخ ) ئەو قسیدەكەی خوێندەوە و كاتێك گەیشتە ئەمە كە ( بخ بخ الوالده و للمولود ) ..!!

(حجاج) ووتی: دوای ئەمەهیچ كات بخ بخ ناكەیت ..؟! ئینجا فەرمانیدا ملیان پەراند كوشتیان.

ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : دوو دیل یان ئه‌سیریان برده لای (حجاج) ئه‌ویش فه‌رمانی کوشتنی ئه‌وانی ده‌رکرد ، یه‌کێك له‌م دوو دیله یان ئه‌سیره ده‌ستی کرد به قسه‌کردن دوای مافی خۆی ده‌کرد .

دیله‌که ووتی : من مافێکم لای تۆ هه‌یه ..؟!

(حجاج) ووتی : چ مافێکت هه‌یه ..؟!

دیله‌که ووتی : رۆژێکیان (کوری ئه‌شعه‌س ) به خراپه ناوی دایکی تۆی برد و من رێگه‌ی ئه‌و کاره‌م لێگرت ..!!

(حجاج) ووتی: چ که‌سێك ئه‌م به سه‌ر هاته ده‌زانێت ..؟!

دیله‌که ووتی: ئه‌م دیله‌ی تر یان ئه‌م ئه‌سیره‌ی تر که له گه‌لمدایه ..!!

(حجاج) پرسیاری له دیله‌که‌ی تر کرد ، ئه‌ویش ئه‌و پیاوه‌ی به راستگۆ دانا ..؟!

پاشان (حجاج) پرسیاری لێکرده‌وه ووتی : ئه‌ی پیاو تۆ بۆ وه‌ك ئه‌م پیاوه‌ی تر به‌رگریت له دایکی من نه‌کرد ..؟!

دیله‌که‌ی تریش ووتی : ئایا راستی هیچ سوودێك به‌من ده‌گه‌یه‌نێت ..؟!

(حجاج) ووتی : به‌لێ .

ئه‌ویش ووتی : ئه‌وه‌ی رێگر بوو له‌و کاره رقێکه یان قینه یه‌که له تۆ و خه‌لکه‌که‌ت له دلی مندایه.

(حجاج) ووتی: هه‌ردووکیان ئازاد بکه‌ن ..!! ئه‌مه‌یان له به‌ر به‌رگری کردن له دایکی من و ئه‌وه‌ی تریشیان له به‌ر ئه‌وه‌ی راستگۆ بوو له ووته‌کانی دا ..؟!

## به‌سه‌رهاتی (الشعبي) له‌گه‌ل (حجاج) دا

به‌لێ کاتێك سوپاکه‌ی (کوری ئه‌شعه‌س ) له (دیر الجماجم ) شکستی خوارد و سه‌ر نه‌که‌ت ، ئه‌وه بوو جارچیه‌که‌ی (حجاج) بانگی دا به ناو خه‌لکدا ، هه‌ر که‌سێك چووه لای یان پێویستی کرد به (قتبیه کوری مسلم ) ئه‌وا ئه‌مانی پێ ده‌درێت ..!! چونکه (حجاج) (قوتبیه کوری مسلم ) کردبووه فه‌رمانداری شاری (الری ) له‌خۆرستان ، خه‌لکی زۆر په‌یوه‌ندیان پێوه کردبوو زۆر چوو بوونه لای ئه‌و ، یه‌کێك له‌وان (الشعبی ) بوو ، ده‌لێن : رۆژێك (حجاج) ئه‌وی بیرهاته‌وه سه‌باره‌ت به (الشعبی ) پرسیاری کرد ..!! (یزید کوری ئه‌بی مسلم ) ووتی : (الشعبی ) رۆیشته یان چوو بۆ شاری (الری ) بۆ لای (قوتبیه کوری مسلم ) ، ئینجا (حجاج) نامه‌ی بۆ (قوتبیه کوری مسلم ) نووسی ، تاکو (الشعبی ) بۆ ره‌وانه بکات ، (قوتبیه کوری مسلم ) هه‌ستا (الشعبی ) بۆ (حجاج) ره‌وانه‌کرد ..؟! (الشعبی ) ده‌لێت : کاتێك له (حجاج) نزیك بوومه‌وه ، چاوم به (یزید کوری ئه‌بی مسلم ) که‌وت که هاورێم بوو و له‌گه‌ل ئه‌و راوێژم کرد یان گفتوگۆم کرد ئه‌و ووتی : ده‌توانی داوای به‌خشین بکه ..؟! وه هاورێ و براکانیشم ئه‌م پێشنیاره‌یان به‌من کرد ، کاتێك رۆشتمه لای (حجاج) شتێکی جیاوازم له‌وه‌م بینی که باسیان کردبوو ، رۆیشتمه‌لای هاوشێوه‌ی فه‌رمانره‌وا سلاوم لێکرد و ووتم : ئه‌ی سه‌روه‌ری من ، خه‌لکان پێشنیاریان کردووه له‌سه‌ر بنه‌مای ئه‌وه‌ی خوا ده‌زانێت و راست و دروسته داوای لێخۆشبوون بکه‌م به‌لام سوێند به‌خوا لێره‌دا ته‌نها راستی و دروستی ده‌هێنمه سه‌ر زومان ..!! سوێند به‌خوا ئێمه دژی تۆ راپه‌رین و که‌سانی دیکه‌مان هاندا و هه‌ولماندا، نه‌خراپه‌کاره به هێزه‌کان بووین نه چاکه‌کاره خۆپارێزه‌کان ، ئێستا خوا سه‌رکه‌وتنی به تۆ به‌خشیوه ..؟! ئه‌گه‌ر سزا بده‌یت ، تاوانی هه‌له و گوناهی خۆمانه و ئه‌گه‌ر ببه‌خشیت له پێشی تۆ نیشان ده‌دات و جیاواز له‌مانه ، راستی به‌زیانی ئێمه به تۆیه ..؟!(حجاج) ووتی : سوێند به خوا تۆ لای من خۆشه‌ویستتر له‌و که‌سانه‌یت که دێنه لای ئێمه و خوێن له شمشێره‌کانیان ده‌چۆرێت و ده‌لێن : مه‌گه‌ر ئه‌و کاره‌مان نه‌کرد ، مه‌گه‌ر له‌و شه‌ره‌دا ئاماده نه‌بووین ، ئه‌ی (الشعبی ) تۆ ئه‌مانت پێ به‌خشراوه ، ئاسوده به ..؟! خه‌لکت دوای ئێمه چۆن بینی ..؟! ووتم : له ئێوه جێگیرێکی باشترم بۆ که‌سانی ونبوی خۆم ده‌ست نه‌که‌وت..!! (حجاج) ووتی : ئه‌ی (الشعبی ) برۆ به‌لای کاره‌کانی خۆته‌وه ، من گه‌رامه‌وه ..!!

## (سعید کوری جوبیر ) و (حجاجی کوری یوسفی سه‌قه‌فی )

به‌لیٚ (سعید ) له گه‌وره تابیعی ته‌قوادارو خواناس شاره‌زا له‌فقهه و زانستی ته‌فسیر یان راڤه‌ی قورئانی پیرۆز ، هه‌روه‌ها خه‌لكانێكی زۆر له هاوه‌لانی پێغه‌مبه‌ری خوای ﷺ بینیوه ،وه‌ك كۆمه‌لێك له‌م هاوه‌لانه كه چه‌ندین فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ری خوایان ﷺ گێراوه‌ته‌وه ، ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : له شه‌وێكدا هه‌موو ختمی قورئانی كردووه ..!!

وه یه‌كێك له ووتانه‌ی كه به‌ناو بانگه (ابن كثیر ) له (البداية والنهاية ) ده‌گێرێته‌وه ده‌لێت : (سعید) ووتویه‌تی : "به راستی باشترین ترسان ئه‌وه‌یه له خودا بترسیت ترسانێك نێوانی تۆ و سه‌ر پێچی كردنت به‌رامبه‌ر خودا بگرێت ، خۆراگریت پیٚ بدات به‌رامبه‌ر گوێرایه‌لی كردنی ، ئا ئه‌وه ترسانی به سووده ، چونكه زیكرو یاد كردنه‌وه خودا گوێرایه‌لیه ، جا هه‌ر كه‌س گوێرایه‌لی خودا بكات ئه‌وه یادی ده‌كاته‌وه و هه‌ر كه‌سیش گوێرایه‌لی خودا نه‌كات زكرو یادی نه‌كردووه ، با تسبیحات زۆر بكات و قورئانیش زۆر بخوێنێته‌وه "..؟!

ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن: پرسار كرا له (سعید كوری جوبیر ) كیٚ له هه‌مووان به‌ندایه‌تی زیاتر ..؟!

ئه‌ویش ووتی : پیاوێك تاوانی كردبێت ، هه‌ركات تاوانێكی خۆی بیرده‌كه‌وێته‌وه به سووك سه‌یری ئه‌و تاوانه بكا كه له رابردووی ئه‌نجامی داوه ..!!

ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن :كاتێك (حجاج) هه‌لی كوتیه سه‌ری ویستی بی كوژێت ، پیٚ ووت به‌لا لێت دا.

(سعید) ووتی: به‌لا له كه‌س بدات كه له به‌هه‌شت جیٚی خۆی له‌ق كرد و خۆی خسته ئاگره‌وه..!!

ئینجا(حجاج) ووتی: به‌ده‌ن له گه‌ردنی ..!!

(سعید) ووتی : شاهێدی ده‌ده‌م كه هیچ خوا یه‌ك نیه به‌حه‌ق جگه له (الله) و محمد ﷺ پێغه‌مبه‌ری خوایه ، وه به‌وه خۆم له تۆ ده‌پارێزم هه‌تا رۆژی دوایی ده‌تبینمه‌وه ، ئیدی ئه‌و رۆژه من دوژمنی تۆم لای خودا ..؟!

دەگێرنەوە دەلێن : لە پشتی ملی دا سەریان بری ، ئەم هاوالی گوشتنی (سعید کوری جوبیر ) گەیشتە گەورە تابیعی (حەسنی بەصری ) ئەویش ووتی : (اللهم یاقاصم الجبابرة اقصم الحجاج) واتە : خوایە گیان ئەی تۆلە سێن و شکێنەری زۆردارەکان لوتی (حجاج) بشکێنە ..؟!

(ابن کثیر ) دەگێریتەوە لە (البدایە والنهایە ) دەلێت : (حجاج) تەنها سێ ڕۆژ مایەوە پاش کوشتنی (سعید کوری جوبیر ) پاش سێ ڕۆژ ، کرمێکی بچووك چووە ناو سگ و هەناویەوە ، ئیتر ناو هەناوی بۆگەن کرد و دایرزاند و پاشان هەر بەم کرمەوە یان نەخۆشیەوە مرد ..!!

دەگێرنەوە دەلێن : (سعید) پێدەکەنی کاتێك هێنرا بۆ ئەوەی بدرێت لە ملی ..!!

ئینجا(حجاج) پێی ووتی : چی تۆی خستە پێکەنینەوە ..؟!

(سعید) ووتی : پێدەکەنم لە بەر ئەو بوێریەی کە تۆ بەرانبەر من هەتە..؟! وە ئەو لە سەرخۆیی و بە ئارامیەی (خوای گەورە)ش کە بەرانبەر بە ستەمی تۆ هەیەتی ..؟!

بەلێ (سعید کوری جوبیر ) لە شاری مککە بوو ، کاتێك (حجاج) دەستی بەسەر شاری مککە داگرتوو کۆتایی بە خلیفە (کوری زوبیر ) هێنا و دواتریش ئەوی کوشت ، ئینجا (حجاج) بەیعەتی لە (سعید ) ساند بۆ (عبدالملك کوری مروان ) خەلیفە ئەمەویەکان ، پاشان (حجاج) کاتێك بە فەرمانی (عبدالملك کوری مروان ) چووە بوو بە فەرمانڕەوای عێراق ، دووبارە بەیعەتی لە (سعید) ساندەوە ، ئینجا ئیمامەتی و پێش نوێژی پێ سپارد ، پاشان دادگەریشی پێ سپارد لە شاری کوفا ، بەلام خەلکی کوفا ، کردیانە هاتو هاوا لە دژی (سعید) چونکە دەیان ووت : ناکرێت و ناگونجێت ناشێت کەسێك دادگەری بکە کە عەرەبێك نەبێت ..!! ئینجا (حجاج) یەکێکی تری دانا لە شوێنی (سعید کوری جوبیر ) ، ئەویش ناوی ( ابو بردە کوری ابی موسی لاشعری ) دانا و لە شوێنی فەرمانی پێکرد کە هیچ فەرمانێك دەرنەکات بە بێ وەرگرتنی بۆ چوونی (سعید کوری جوبیر ) ، پاشان سەد هەزار دەرهەمی پێدا کە دابەشی بکات بەسەر خاوەن پێداویستەکاندا.!!

ده‌گێرنه‌وه کاتێك (کوری ئه‌شعه‌س ) به سوپاکه‌یه‌وه ده‌رچوو ، بۆ لای پاشا (روتبیل) ، له‌و کاته‌دا (حجاج) هه‌ستا (سعید کوری جوبیر ) کرده خه‌زێنه داری سوپاکه‌ی (کوری ئه‌شعه‌س ).

ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : (حجاج) ( سعید کوری جوبیر ) نارد بۆ لای (کوری ئه‌شعه‌س ) به نامه‌یه‌وه ، که تیایدا (حجاج) له نامه‌که‌یدا وه‌لامی (کوری ئه‌شعه‌س ) دا بوویه‌وه ، وه سه‌رزه‌نشتی کردبوو باسی خراپه‌کانی ئه‌وی تێدا باس کرد بوو ، جا کاتێك (سعید ) چووه لای (کوری ئه‌شعه‌س ) ئه‌وه بوو سپرزه بوو و ترسالێی ، چونکه (سعید) پیاوێکی خواناس شاره‌زا بوو له راڤه‌ی قورئان زانایه‌کی گه‌وره‌ی خه‌لکی عێراق بوو ، ئه‌ویش (سعید)ی پێشانی خه‌لکی نه‌دا ، ئینجا دوو به دوو دانیشت له گه‌ل یه‌کتری ده‌ستیان به گفتو گۆ کرد ، (کوری ئه‌شعه‌س ) هه‌ولی ده‌دا که (سعید) له گوێرایه‌لی کردنی (حجاج ) هه‌لگه‌رێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی پێگه‌ی خۆی و سوپاکه‌ی به‌هێز بکات ، به‌لام (سعید ) به پێچه‌وانه‌ی ئه‌و بیری ده‌کرده‌وه ، چونکه پێی باش نه‌بوو ، ده‌ر چوونی له فه‌رمانی (حجاج) و هه‌لگه‌رانه‌وه لێی به باش نه‌ده‌زانی ، به‌لام له کۆتاییدا (کوری ئه‌شعه‌س ) کۆلی نه‌دا و لێی پێداگری کرد ، پاساوی بۆ هێنایه‌وه باسی جه‌ندین خراپه کاری زۆردای خوێن رشتنی (حجاج)ی بۆ کرد ، هه‌تاکو (سعید کوری جوبیر ) ی رازی کرد ، به‌لام (سعید ) به نا به دلی پێی رازی بوو ..!!

ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : له یه‌کێك له جه‌نگه کان (سعید ) به دیل گیرا ، ئه‌وانیش هێنایانه لای (حجاج) ئه‌ویش ووتی : به‌لا لێت دا ، ئه‌ی (سعید) ئایا شه‌رم ناکه‌ی له‌من و ته‌ریق نابیته‌وه لێم ..؟!یان ئایا شه‌رمت نه‌کرد له‌و چاودێره‌ی سه‌ره‌وه‌ی من خۆت ..؟!

ئینجا(سعید) ووتی : خوا چاك بۆ فه‌رمانده بکات ، ته‌مه‌نی درێژ بکات ، ئه‌و کاره‌ساتێك بوو یان فیتنه ئاشووبێك بوو روویدا ، سزایه‌ك بوو دابه‌زی قسه‌ش قسه‌ی فه‌رمانده‌یه ، چۆنی پێ باشه با وابێت ، به‌لام من وه‌ك پیاوێك که لووتی پێ به‌رزکراو کردیانه زۆردار ، به‌گری ئاژاوه‌ی کرایه به‌ر ، شه‌یتان چووه سه‌ر شانه‌کانی ، هاتوومه‌وه ، جا ئه‌گه‌ر سزا درا ئه‌وه تاوانی خۆیه‌تی ، ئه‌گه‌ریش لێی خۆش بووی ئه‌وه ئاکاری جوانی خۆته ..؟!

(حجاج) ووتی : ئه‌وا ئێمه‌ش لێت خۆش بووین ، جارێکی تریش ده‌تگه‌رێنینه‌وه بۆ لای ..!!

دەگێرنەوە دەلێن : (حجاج) نامەیەکی دایە دەستی (سعیدی کوری جوبیر ) ناردی بۆ لای (کوری ئەشعەس ) ئینجا (سعید ) لە ڕێگادا نامەکەی سووتاند و ،وە هەوالەکەی بە (کوری ئەشعەس ) ڕانەگەیاند..!!

دەلێن : لەو کاتەوە (سعید ) لەگەل (کوری ئەشعەس) مایەوە لە گەلی دا بوو تاکو جەنگی (دیر الجماجم ) ڕوویدا ، جەنگەکە یەك لای بوویە بە سەر کەوتنی سوپاکەی (حجاج ) ، وە (کوری ئەشعەس ) شکستی هێنا لە جەنگەکە سەر کەوتوو نەبوو ، ئەوەی کوژرا کوژرا ئەوەی بریندار بوو بریندار بوو ، ئەوەی خۆی بەدەستەوە دا خۆی بەدەستەوە دا ، ئەوەشی ڕای کرد لە ترسی (حجاج) ڕای کرد ، بەلام (سعید کوری جوبیر ) یەکێك بوو لە کەسانە ئەویش ڕای کردو چووە بۆ شاری (ئەصبەهان ) ، ئینجا (حجاج) نامەی نووسی بۆ والیە کە یان کاربەدەستەکەی ئەوێ کە (سعید) دەست گیر بکەن ، ئەویش ئەمەی بە باش نەدەزانی ئەم کارەی ئەنجام نەدا ، پاشان (حجاج) نامەیەکی نووسی بۆ (سعید) کەئەم شارە بەجێ بهێلێت و بچێتە دەرەوە ، ئەویش کۆچی کرد بۆ ولاتی (ئازەربایجان ) ..!!

دەگێرنەوە دەلێن : (سعید) ماوەیەکی زۆر لە ئازەربایجان مایەوە ، دواتر بێزار و بێ تاقەت بوو لەوی ، ئینجا بە نهێنی چۆوە بۆ شاری مککە ، لەوێشدا بەنهێنی خۆی شاردەوە لە ترسی (حجاج).

پاشان لە شاری مککە کەسێك بووە کاربەدەست ، بەناوی (خالد القسری) ، ئینجا هەندێك کەس بە (سعیدی کوری جوبیر) یان ووت : کە هەلبێت  وە ڕابکات ..؟!

بەلام (سعید ) ووتی : ئیتر شەرم دەکەم ، لە شتێك کە (خوای گەورە ) بۆی داناوین ، ڕابکەی یان هەلبێت ..!!

بەلام شاری مەدینە (عماد کوری حیان المری ) کاربەدەست فەرمانڕەوای ئەوێی دەکرد ، خەلکی عێراق دەناردەوە بۆ لای (حجاج) ، بە هەمان شێوە (خالد القسری) چاوی لەم کرد ئەویش خەلکی عێراقی یان خەلکی شاری کوفا بەصرای دەنارد بۆ لای (حجاج) ..!!

(خالد القسری ) کاربەدەستی شاری مککە ، ئەم کەسانەی ناردەوە بۆ عێراق بۆ لای (حجاج) ئەمانەبوون : ( عطاء بن ابي رباح) و ( عمرو بن دينار ) و (طلق بن حبيب ) و (مجاهد ) هەروەها (سعید کوری جوبێر ) یەکێك بوو لەوانە کە (خالد القسر ) ناردیەوە بۆ لای (حجاج ) ..!!

دەگێرنەوە دەڵێن : (حجاج) لە م دووانە خۆش بوو ،( عطاء بن ابي رباح) و ( عمرو بن دينار )چونکە ئەمانە خەڵکی شاری مککە بوون ، وە (طلق بن حبيب ) ئەویش لە رێگادا مرد کرد ، وە (مجاهد) زیندانی کرد تاکو ئەوکاتەی (حجاج) مرد ..!!

بەڵام کاتێك (سعیدی کوری جوبێر) یان نارده لای (حجاج) زۆر غەمبار بوو خەفەتبار بوو ، ئازاری خوارد پاشان پیٚ ووت : ئەی سعید ! ئایا کە هاتمە ناو شاری مککە بەیعەتم لیٚ وەرنەگرتیت..؟!

(سعید) ووتی: بەلیٚ .

(حجاج) ووتی : ئایا دادگەریشم بە تۆ نەسپارد و خەڵك کەوتنە هاتو هاوار ، ووتیان: هیچ کەسێکی تر بێگە لە عەرەب بۆ دداگەری ناشێت ، ئینجا منیش (ابو برده بن موسی الاشعری )م کردە دادگەر بە مەرجێك بریارێك بیٚ تۆ دەر نەکات ..؟!

(سعید) ووتی : بەلیٚ. وا بوو ..!!

(حجاج) ووتی : ئایا نەم خستیە ناو کۆری دانیشتنی شەوانەوە کە هەمووی لە گەورەکانی عەرەب بوون ..؟!

(سعید) ووتی : بەلیٚ .

(حجاج) ئایا سەد هەزار دەرهەمم پیٚ نەدایت بیدەیت بە خاوەن پێداویستیەکان ، پاشان پرسیاری هیچ شتێکم لیٚ نە کردیتەوە ..؟!

(سعید) ووتی : بەلیٚ . وابوو ..!!

ئیمامی (الذهبی ) لە تاریخەکەیدا دەگێڕێتەوە باسی ئەوە دەکات کە (حجاج) یەك لە دوایی یەك ئەو پرسیارانەی لە (سعید ) دەکرد ، ئەینجا (سعید) پیێ ووت : من کەسێکم لەو موسلمانانەی ، کە جارێك ڕاست دەکات و جارێك هەلە دەکات ..!!

ئینجا دەرونی (حجاج) پاك بوویەوە و دلینا بوویەوە ..!!

پاشان (حجاج) جارێکی تریش گەڕایەوە پیێ ووت : چی وای لێکردی ڕاپەڕین دژی من بکەیت..؟!

(سعید) پێی ووت : لە گەردنمدا ، پەیمانێك هەبوو بۆ (کوری ئەشعەس) ، چونکە ئو سوێندی دابووم تکای لیێ کردم ..!!

پاشان (حجاج ) تووره بوو ووتی : هێی ! پایەندبوون بە پەیمانێکەوە کە بە دوژمنێکی خوات دا بو  بە حەقت زانی و ئەو پەیمانە ی بە ئەمیری باوەرداران و منت دابوو بە ناحەق زانی ..؟!

(حجاج) ووتی : تۆ  دوو پەیمان و بەیعەت هەلدەوەشێنیتەوە و بەوەفا دەبیت بە یەك پەیمانەوە بۆ ئەو فشکەری کوری فشەکەرە ..!! " مەبەستی (کوری ئەشعەس ) بوو "

ئینجا (حجاج ) ووتی : لە ملی بدەن سەری بپەڕێنن ..!!

(ابن جرير الطبري ) و (ابن كثير ) نقلی كردووه له (البداية والنهاية ) دا،له (ابي بكر باهيلي ) ووتی : بيستم له (انس ابن شيخ ) ده ی ووت : كاتێك (سعيدی كوری جوبير )يان هێنايه لای (حجاج) چووه پێشەوه لیٚ پێی ووت: ئەی (سعيد) ئايا چی بوو تۆی لەمن هەلگێرايەوه ..؟!

(سعيد) ووتی : خوا چاك بۆ فەرمانده بكات، منيش يەكێكم لەو موسلمانانەی كه جارێك راست دەكات و جارێك هەله دەكات ..!!

ئينجا (حجاج) دەروونی ئارام بوويەوه ، رووخساری گەشايەوه و (حجاج) تكای لێكرد كه ئيتر واز له كاری ئەو بێنێت ، پاشان بۆ شتێك گەرايەوه لای (سعيد ) ..!!

(سعيد) پیٚ بووت : بەيعەتێك يان پەيمانێكم لەگەردن دابوو ..!!

لەو كاتەدا (حجاج) تووره بوو ، فەرمانی كرد له ملی بدەن ، ئەو قسەی بووه هۆی كوشتنی ..!!

(عتاب بن بشر سالم الافطس ) دەلێت : (سعيد) يان هێنايه لای (حجاج) دەيوست سواری ئەسپەكەی ببێت ، و قاچێكيانی كردبوو به ناو ئاوزەنگی زينی ئەسپەكەيدا قاچەكەی تريانی هێشتا له سەر زەوی بوو ، (سعيد) ووتی : به خوا سوار نابم تاكو شوێنی خۆت له دۆزەخ دەبينيت ، ئينجا (حجاج) ووتی : بدەن له ملی ..!!

دەگێرنەوەش دەلێن : (حجاج) له بەر خۆيەوه دەی ووت : (قيودنا ... قيودنا ) واته : كەلەمچەكان كه لەمچەكان واته كۆت زنجيرەكان ، ئەوانيش وايانزانی كۆت و كەلەپچەكان دەوێت ، كه له دەست قاچی (سيعدی كوری جوبير ) دابوو ، هەر بۆيه هەردوو قاچيان له نيوەوه بريەوه ، كۆتاكانيان هەلگرتەوه ..!!

لە (عبدالملك بن عبدالله خباب ) دەگێڕیتەوە دەڵێت : (سعید)یان هێنا بۆ لای (حجاج) ئینجا پاشان (حجاج) پێ ووت : بە خوا دەت کوژم ..؟!

(سعید) ووتی : کەواتە من (سعید) م وەك دایکم ناوی ناوم (سعید) واتە : شادومان یان کەسێکی بەختەوەر ، یانی ئەگەر بمکوژی بەراستی من شادومانم و بەختەوەرم ، وەك دایکیشك ئەو ناوەی لێ ناوم ..؟! دەڵێن : ئینجا (حجاج) کوشتی و لەملی پەراند ..!!

دەگێڕنەوە دەڵێن : ئیتر دوایی ئەوم رووداوە دلتەزێنە (حجاج) تەنها چل رۆژ لە ژیاندا مایەوە، کاتێك دەخەوت لە خەودا دەیبینی چمکی کراسەکەی دەگرت و دەی ووت : ئەی دوژمنی خوا لە بەرچی کوشتم ..؟! یان دەی ووت : ئەی چی لەمن و (سعید) هات چیمان بەسەر هات ..!!

(ابن خلکان) دەڵێت : (سعید کوری جوبیر کوری هیشامی ئەسەدی ) یەکێك بووە لە ژێر دەستەکانی (بنی والبه ) ی کوفی بووە ، یەکێك بوو لە کەسایەتیە دیارەکانی تابیعین و ئەو پیاوە رەش پێست بووە ..!!

وە باس لەوە دەکەن کە کوشتنی (سعیدی کوری جوبیر ) لە مانگی شەعبان دابووە ، لەدوای کوشتنی ئەو ، (حجاج )یش پاش ئەو لە مانگی رەمەزانی سالی (٨٤) کۆچیدا مردووە ..!!

هەندێك گێڕانەوەی تریش هەن ، دەڵێن : دوای کوشتنی (سعید) ، (حجاج) بە سێ رۆژ تووشی نەخۆشیەکی زۆر کوشندە دەبێت ، ئەڵێن کرمێکی بچووك دەچێتە ناو سگ و هەناویەوە ..!!

پاشان دوای ئەو نەخۆشیە دەمرێت ، بەلام هەندێك دوای مردنەکەی (سعید) (حجاج) دوای چل رۆژ دەمرێت هەندێکی تریش دەڵێن : دوای مردن (سعید ) ، (حجاج) دوای پانزە رۆژ دەمرێت ، هەندێکی تریش دەڵێن : دوایی شەش مانگ (حجاج) دەمرێت ..!!

## (ئەنسی کوری مالك) و (حەجاج کوری یوسفی سەقەفی)

بەلێ (أنس ابن مالك ابن النضر) – خوا لێ رازی بێت – ئەم هاوەلە ئەنصاریە و لە هۆزی خەزرەجە ، لە شاری مەدینە لە دایك بووە ، هەر لە منداڵیەوە موسڵمان بووە ، بۆ ماوەی (١٠) ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوای ﷺ کردووە ،هەروەها پێغەمبەر ﷺ نازناوی لێناوە (ابو حمزە).

پێغەمبەری خوا ﷺ دوعاو پارانەوەی بۆ کردووە فەرموویەتی : قالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ للنبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: أنَسٌ خَادِمُكَ، قالَ: ((اللَّهُمَّ أكْثِرْ مَالَهُ، ووَلَدَهُ، وبَارِكْ له فِيما أعْطَيْتَهُ)) ، هەر بۆیە (ئەنس کوری مالك ) تەمەنێکی درێژ ژیا ، وە (خوای گەورە) نەوە و منداڵ و کوری زۆری پێ بەخشی ، ئەم هاوەلە زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ ، ئەو هاوەلە گێراویەتەوە ، لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێ بووە ، دایکی (ئەنس ) ناوی (أم سلیم ) بووە ، دەگێرنەوە دەلێن: ئەم ئافرەتە بەشداری جیهادی کردووە لە غەزای ئوحودا ، لەگەڵ دایکی باوەرداران (عائیشە ) – خوا لێ رازی بێت – ئاویان دەدا بە موجاهیدەکان ، وە لە غەزایی (حونێن ) بە پێغەمبەریان ﷺ فەرموو : ئەمە (ام سلیم ) خەنجەری پێیە ..؟! (ام سلیم ) ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەر بێ باوەرێك یان مشرکێك لێم نزیك بێتەوە سکی پێ هەڵدەدرم ..!! لە (ئەنسی کوری مالك ) خۆی دەگێریتەوە دەلێت : دایکم دەستی گرتم بردمی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ پیاو یان ئافرەتێکی ئەنصاریەکان نەماوە دیاریەکی پێشکەش بە تۆ نەکردبێت ..!! من ناتوانم هیچ دیاریەکت پێ ببەخشم بێجگە لەم کورەم ..!! دایکم فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیبە بۆ خۆت با خزمەت بکات ..؟! ئیدی باش ئەوە (١٠) ساڵ خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ بووم ، هەروەها دەگێریتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماوەی ئەم (١٠)ساڵە نە لێدام و نە رۆژێك قسەیەکی ناخۆشی پێم فەرموو ، نە رۆژێك لێم توورە بوو ، بۆ تەنها جارێکیش رووی گرژ نە بوو بە روومدا ..!!

دەگێرنەوە لە دوای پێغەمبەری خوا لە خلافەتی (ابو بکر صدیق ) و (عمری کوری خەتاب ) ئەوان کردیانە کاربەدەستی دەریاوانی ، پاشان لە مەدینە باری کرد رووی کرد شاری بەصرا لەم شارە نیشتەجێ بوو ..!! پاش ماوەیەك کە (کوری ئەشعەس ) راپەرینەکەی دەست پێکرد دژی (حجاج) و دەولەتی ئەمەویەکان ، لەم نێوانە ئەم هاوەلەش لە ئاژاوەیە و فتنەیە پرشکی بەرکەوت..!!

بەلێ (ئەنس کوری مالك ) ئازار ئەشکەنجەی لە لایەن (حجاج) و دارو دەستەکەی پێگەیشت ، چونکە لەو فیتنەو ئاشووب و ئاژاوەیەدا ئەویە کە (کوری ئەشعەس ) و (حجاج) بەرپایان کرد ، ئینجا (حجاج) وا گومانی لە (ئەنس ) کرد کە ئەویش دەستی هەیە لەم راپەرینەدا ، چونکە ئەو فتوای داوە ، هەر بۆیە (حجاج) مۆری لە گەردەنی دا ، ئەمەش بەد رەوشتی بێ ئەدەبی گەورەیی (حجاج)ی دەرخست ..!! هەر بۆیە لەم ئازارو ئەشکەنجەیە (ئەنس ) ئەوە بوو سکالای کرد لە لای خەلیفەی موسلمانان (عبدالملك کوری مروان ) ، نامەی بۆ نووسی ، ئەویش نامەکەی (ئەنس)ی خوێندەوە ، نامەیەکی نارد بۆ (حجاج) لە عێراق ، لە نامەکەی (عبدالملك کوری مروان ) دا هاتبوو ، کە بەشێوەیەکی زۆر توورە سەرزەنشتی (حجاج)ی کردبوو ، هەر ئەوە بوو (حجاج) لە توورە بوونەکەی ئەمیری باوەرداران زۆر ترسا ..!! ئینجا دواتر (ئەنس کوری مالك ) بانگ کرد و ئاشتی کردەوە ، دەگێرنەوە دەلێن : (ئەنسی کوری مالك ) هەشت غەزایی لەگەل پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە ..؟! وە لە شاری بەصرا کۆچی دوایی کردووە ، هەروەها رای جیاواز هەیە لەسەر سالی مردنەکەی چونکە ئەو کۆتاهەمین هاوەل بووە کۆچی دوایی کردووە، هەندێك دەلێن : سالی (٩٠) ك یان (٩٢) ك یان (٩٣) کۆچی ..!!

(ابن کثیر ) لە (البدایه والنهایه ) دا باسی دەکات لە (عوانی کوری حکمی کلبی ) دەلێت : (ئەنسی کوری مالك ) چووە لای ( حجاج ) کاتێك لێ نزیك بوویەوە چووە بەردەمی راوەستا و سلاوی لێکرد ..!! (حجاج ) ووتی : ئێ ئێ تۆ (ئونەیس) یان أُنیس ...لە سەر وەزنی (فُعیل) ناوی بچووك کراوەیە ، هەندێك جار بۆ سووکردن و کەمکردنەوەی بەرانبەر بەکاردەهێنرێت ..!! ئینجا (حجاج ) پێ ووت : تۆ رۆژێك لە گەل (علی کوری ئەبو تالیب ) بووی ، رۆژێك لەگەل (کوری زوبێر ) ، رۆژێکیش لە گەل (کوری ئەشعەس ) بوویت ، دەبخوا ریشەکێشت دەکەم وەك ریشە کێشکردنی رەگی دارو دەرخت ..؟!

بەلێ پاشان (ئەنسی کوری مالك ) لەلای (حجاج) رۆیشت ، ئینجا نامەی نووسی بۆ خەلیفە (عبدالملك کوری مروان ) لەشامدا ، ئەوەی (حجاج) پێ کردبوو هەبووی تێدا باس کردبوو ، پێ راگەیاند ، جا کاتێك (عبدالملك کوری مروان ) نامەکەی (ئەنسی کوری مالك ) کردوە پاشان خوێندیەوە ، تەواو توورە بوو ، چاوی چووە پشتی سەریەوە ،ئەوەشی بە لە خۆبایی و جاهلی و غروری ستەمکاری لووت بەرزی زانی ..!!

سەرەتایی توورەبوونی ناكۆكی (حجاج) لەگەل (ئەنسی كوری مالك ) لە سەر ئەوە بووە كە یەكێك لە كورەكانی (ئەنسی كوری مالك ) بەشداری كرد لە راپەرینەكەی (كوری جارود ) لەدژی (حجاج) بەلام دواتر هەر لەم راپەینەدا كورەكەی بەدەستی (حجاج) كوژار ، بەلیّ باش ئەو ناكۆكیە (ئەنس) نامە بۆ (عبدالملك كوری مروان ) دەنێرێت، ئەمەش دەقی نامەكەیە : " بە ناوی خوای پەخشندە و میهرەبان ... بۆ (عبدالملك كوری مروان ) ئەمیری باوەر داران ، لە (ئەنسی كوری مالك )ە وە ... پاش سوپاس و ستایشی خودا ... بەراستی (حجاج) قسەی ناشرین و نەشیاوی پیّ ووتم و ورێنەی دا بەگوێمدا ، كە من ئەهلی ئەو شتانە نیم و شیاوی ئەو سووكایەتیە نیم ..! ! تۆش رزگارم كە لەدەستی ، من ماوەیەكی دووروو درێژ لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دابووم و هاوەلی بووم ...والسلام علیك ورەحمە الله وبركاتە ... "

هەر بۆیە (عبدالملك كوری مروان ) ناردی بەدوای (اسماعیل كوری عبیدالله كوری ابو مهاجیر ) دا كە هاوریّ (حجاج) بوو ، (عبدالملك كوری مروان ) دوو نامەی دایە دەستی پێی ووت : ئەم دوونامەیە بگر بیانبە بۆ عێراق ،یەكەم نامە بدە دەستی (ئەنسی كوری مالك ) دووەمیان بدە بەدەستی (حجاج) بەلام كاتێك (اسماعیل ) نامەكەی دا دەستی ، ئینجا كاتێك نامەكەی كردەوە خوێندیەوە (حجاج) ووتی : ئەی (اسماعیل ) بمانبە بۆ لای (باوكی حمزە ) (ئەنسی كوری مالك) داوای لێبردنی لیّ بكەین و ئاشتی بكەینەوە ..! !

(اسماعیل ) ووتی : پەلە مەكە ..؟!

(حجاج) ووتی جۆن پەلە نەكەم لەكاتێك دا ، ئەم بەلایەت بۆ هێناوم ..؟!

نامەكەی (عبدالملك كوری مروان ) بۆ (حجاج) بەم جۆرە بوو:

" بەناوی خوای گەورە و میهرەبان ... لە (عبدالملك كوری مروان ) ئەمیری باوەردارانەوە بۆ (حجاجی كوری یوسفی سەقەفی ) ..! ! تۆ بەدەیەكی بەزكرایتەوە كەچی تۆ لە رێگای خۆت لاتداوە سنووری خۆت بەزاندوە یان تێپەراندوە ، بەدوای وەیدا دەگەرێی ، كەواتە دەتەویّ بمشكێنی و لە ناوم ببەیت ..! ! گەر مەجالت پیّ دەم بێت رادەكێشیت ..! ! وە ئەگەر رێم پیّ نەدایت دەگەرێتەوە دواوە ..! ! خوا نەفەرتت لێدەكات لە بر ئەو بدە چاو كزبووە پیرە ..! !

ئەی کوری فلان ، دە بە خوا وەك شێر پەلاماری ڕێوی بدات و باز پەلاماری کەروێشك بدان دێم بۆت ..!! تۆ هەلت کوتاوەتە سەر پیاوێك لە هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ ،لەبەر چاوی ئێمەدا، چاکەکانی وەرناگری و لە خراپەکانیشی چاو پۆشی ناکەیت ..!! ئەوە نەترسی تۆیە لە (خوای گەوە) ، هەروەها سوکایەتی کردنە بە پەیمان و یان بەیعەتی خەلافەت ..؟! بە خوا جوولەکە و نصرانیەکان پیاوێکیان بینی بایە خزمەتی (عوزیر ) و (موسی ) و (عیسی ) — علیەالسلام — کردبایە ڕێزیان لێدەنا و بەگەورە تەماشایان دەکرد ، چۆن تۆ ئەمە لەگەل (ئەنس کوری مالك) دەکەیت ..؟! کە خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بووە ، وە هەشتا سال تەمەنیەتی ، پێغەمبەر ﷺ نێهێنیەکانی پێ دە ووت و لە کاروبارەکانیدا راوێژی پێ دەکرد ئەو لەگەل ئەوەشدا یەکێك لەو هاوەلانەی کە ماوەنەتەوە تاکو ئەم کاتە لە ژیاندا ..؟!

لە (ئیمامی احمد ) دەگێریتەوە لە (ابن عدی ) دەلێت : ئێمە سکالامان بردە لای (ئەنسی کوری مالك ) سەبارەت بەوە رەفتارو کارو کردارانەی (حجاج ) دەبینرا ، (ئەنس ) ووتی : ئارام بگرن سالٚ لەدوایی سالٚ و رۆژ لە دوای رۆژ ئەوەی بەدوایدا دێت خراپتر دەبێت لەوەی پێش ..!! هەتا دەگەرێنەوە بۆ لای (خوای گەورە ) ... من ئەوە لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بیستووە ..!!

لە (سفیانی سووری ) دەگێرتەوە لە (الشعبی ) دەلێت : رۆژێك دادێت خەلکی درود و رەحمەت بۆ (حجاج ) بنێرن ، دە بخوا گە کەوتنە ئەو رۆژە ، ئاوات بە (حجاج) دەخواونەوە ..!!

لە (میمون کوری مهراب ) دەگێرتەوە دەلێت : (حجاج) ناردی بە دوایی (حسن بەصری ) دا ئەویش چووە بەردەمی راوەستا ووتی : ئەی (حجاج) لە نێوان تۆ و ئادەم — علیە السلام — چەند پشت هەیە ..؟!

(حجاج) ووتی : زۆر ..!!

(حسن بصری ) ووتی : دەی لە کوێن ..؟!

(حجاج) ووتی : مردن ..!!

ئیتر (حجاج) سەری داخست و (حسن بصری )یش رۆیشتە دەرەوە ..!!

له (ابن عائیشه)وه دەلێت : پیاوێك له هەلگەراوکانی دژی ئەمەویەکان هێنرایه بۆ لای (ولیدی کوری عبدالملك کوری مروان ) که کورەکەی لەدوای باوکی دەبێته خەلیفه یان جێ نشین ، کەواته : (ولید کوری عبدالملك ) به پیاوەکەی ووت : چی دەلێت له بارەی (ابو بکر صدیق ) و (عمری کوری خەتاب ) ..؟! ئەویش ستایشی کردن و به باشی باسی کردن ..!!

ئینجا (ولید ) ووتی : ئەی دەربارەی (عوسمانی کوری عەفان ) دیسان ئەویشی به باشی باس کرد ..!!

ئینجا (ولید) به پیاوەکەی ووت : ئەی دەربارەی (عبدالملك کوری مروان ) که دەکات باوکی ، چی دەلێت ..؟!

پیاوەکەش ووتی : ئێستا کاتی هاتووه بلێم ، که (حجاج ) یەکێکه له هەلەکانی و خراپەکاریەکانی (عبدالملك کوری مروان ) ..!!

دەگێرنەوه دەلێن : جارێکیان له (سعید کوری جوبیر) یان پرسی ئایا بۆ له فەرمانرەوایەتی (حجاج) دا لاتدا هەلگەرایەوه لێی ..؟!

ئەویش : ووتی : نارازی نەبووم له فەرمانرەوایەتیەکەی هەتاکو (حجاج ) بێ باوەر نەبوو..!!

(هشامی کوری حسان ) دەلێت : ئەگەر به ووردی و له سەر خۆیی ئەو که سانەی (حجاج) کوشتوونی یان به دەست و به فەرمانی (حجاج) کوژراون ، بژمێرن ژمارەیان گەیشتۆته به نزیکەی (سەدو بیست هەزار ) ، (١٢٠٠٠٠) کەس ..؟!

دەگێرنەوه دەلێن : (سلیمانی کوری عبدالملك ) له یەك بەیانی دا به نزیکەی هەشتا و یەك هەزار ئەسری یان دیلی بەردا ، له دوایی مردنی (حجاج کوری یوسفی سەقەفی ) له زیندان و بەندینخانەکانیان ، یەکێك له بەندیخانەکانیان کردەوه بینیان به نزیکەی سی سێ هەزار بەندکراوی تێدایه ..!! دەلێن : یەکێك له بەند کراوەکان ، له سەر ئەوەی بەندکرا بوو میزی بەدیوای شاری واست دا کردبوو ، ئەو پیاوه دەشتەکی بوو لەسەر ئەمه بەند کرا بوو ..؟!




## چەند ووتە و ڕووداوێکی (حجاج) لە ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەیدا

بەڵێ مرۆڤ هیچ نیە جگە لە چەند هەلوێست و ڕووداو مێژوویەك ، چونکە ئەمرۆمان دە دەبێتە مێژوو بۆ بەیانی ، لە ڕاستیدا زۆربەی مرۆڤە ژیرەکان هەول و کۆشش دەکەن کە ڕابردووی خۆیان بنیات بنێن بۆ داهاتوویەکی گەش کە چاوەڕێی هەموو کەسێك دەکات ئەویش ئەو بەهەشتەیە کە (خوای گەورە ) بۆ بەندەکانی دروست کردووە ، ئەوی ڕابردووی لە دونیادا پاك بێگەر بێت ، بەلێ لە ڕابردوو دا چ زالم و ستەمکارێك نەماوە تاکو ئێستا ، جگە لەو خراپەکاریەی کە لەدوایی خۆیەوە مێژوو باسی دەکات ، هەر کەسێکیش چاکەیەکی کردبێت ، ئەوا هەم لە لای (خوای گەورە) وون نابێت ، وە ئەم چاکەیەی بۆ تۆمار دەکرێت لەسەری پاداشتی دەدرێتەوە ، هەم لە دوای خۆشی خەلکی وەك مێژوو بۆی تۆمار دەکەن وون نابێت ، بەلام ئەوەی خراپەیەکی کردووە بەهەمان شێوە وونابێت لە لای (خوای گەورە ) سزای لەسەر وەردەگرێت ، جا چ لە دونیا دا یان چ لە قیامەتدا ، هەروەها لە لای خەلکیش دەبێتە ڕابردووی ستەمکاری بۆ ، ئەوا سات بە سات بۆی تۆمار دەکرێت ، لە لاپەرە ڕەشەکانی مێژووی ، ئەگەر لە پەرتووکێك دا ئەو خراپەکاریەی ئەو زالم و ستەمکارانەی میژوو تۆ مار بکەین گەلێك زۆرن تەنها ئەگەر هی یەکە ستەمکاریش بێت ، بەلام بەدلنیایەوە (خوای گەورە ) هەموو کردەوەکانی هەژمار دەکات ، ووردو درەشتی بۆ تۆمار دەکرێت ڕۆژێکیش دێت هەر هەمووی دەدرێتەوە بەرچاوی و لێپرسینەوەی لە گەلدا دەکرێت..؟!

ئەگەر سەیری زالم و ستەمکارەکانی میژوو بکەین دەبینین هەر هەموویان مێژوو تۆماریان کردووە بە ستەم و کردەوە خراپەکانیان لە کاتی فەرمانڕەوایەتی دا ،خۆ ئەگەر یەك چاکەشیان کردبێت ئەوا هەر تۆمارکراوە لە مێژوو دا یان هەر هەلوێست ڕووداوێکیان کردبێت بێ گومان هەر تۆمار کراوە ، ڕابردوو یان مێژووی هەر فەرمانڕەویەك پەند و عبیرەتە بۆ ئەوانەی لە داهاتوو دا دێن ، چونکە ستەم کردن ناو ناتۆرەی خراپی لێدەکەوێتەوە ناوی دەزرێت دەخرێتە لاپەرەی ڕەشی مێژووە ، جیل بۆ جیل و نەوە لە دوای نەوە لە ناو خەلکی دا دەگێڕنەوە لەو زولم و ستەم زۆرداریەکە کە ئەنجامیداوە ، وەکو دەلێن : مێژووی ڕەش ڕەحم یان بەزەیی بە هیچ کەسێك دانایەوتەوە هەر باس دەکرێت ، وەکو دێوە زمە لە نێو خەلکی دا ، (حجاج کوری یوسفی سەقەفی ) یەکێکە لەو فەرمانڕەوەیانەی کە مێژوو زۆر بە خراپی لە حوکمرانی باسی کردووە ، سەتەمی زۆری کردووە خەلکی زۆری زیندانی کردووە کوشتووە ، بەلام لەهەمان کاتدا هەلوێستی هەبووە.

بەلێ (حجاج) چەندین هەلوێست و چیرۆکی هەیە کە هەیانە باشە هەشیانە ناخۆش خەمناکە یان دەرخەری تووڕەییە ..؟!

لە (ابن ابی دونیا ) لە مسنەدەکەیدا ئەویش لە (عبداللە کوری محمدی تمیمی) دەلێت : بیستم پیاوێك لە قورەیش کە نازناوی خێزانەکەی (ابو بکر تمیمی ) بوو ووتی: " (حجاج) کە خاوەنی زمانێکی پاراو بوو ، لە ووتارێکدا دەی ووت : (خوای گەورە) ئادەم و وەچەکانی دروست کرد لە زەویدا و رەوانەی سەر رەوانەی سەر پشتی زەوی کرد ، بەروبوومەکانی زەویان خوارد و وە لە ئاوی رووبارەکانیان خواردەوە و شرو شپرەزەیان کرد تێکیاندا بە گشت و گەران بە ناویدا ، پاشان (خوای گەورە) زەوی لێسەندنەوە هەم دیسان گەراندنیەوە بۆ ناوی ، ئیدی ئەویش گۆشتەکانیان خوارد وەك چۆن ئەوان بەروبوومەکەیان خوارد ، خوێنیانی خواردەوە وەك چۆن ئاوی رووبارەکانیان خواردەوە ، لە هەناویدا دایرزاندن و لەت و کوتی کردن و جومگەکانی لێکترازاند وەك چۆن ئەوانیش بە گەشت و گەران شرو شپرزەیان کرد "..؟!

دەگێرنەوە دەلێن : " ئەوەیە کە جارێك (حجاج) ووتی : ئەی پیاو ، کە هەمووتان ئەو پیاوەن ، پیاوێك کە نەفسی خۆی بەزاند و حلەوی کرد ، ئینجا ئەو بەستنەوەیە بردی بەرەو گوێرایەلی (خوای گەورە ) و لە سەرپێچی کردنی (خوای گەورە ) لای دا یان سنووری بەزاند ، وە (خوای گەورە) رەحم بەزەیی بەو مرۆڤە بکات کە نەفسی خۆی دەگرێت ، دەروونی خۆی سەرزەنشت دەکات ، نەفسی خۆی وەك دوژمن سەیردەکات ، لێپرسینەوە لە خۆی دەکات پێش ئەوەی لێپرسینەوە لە خەلکی بکات ، کەسێك کە سەیری تایی تەرازووی خۆی دەکات ، سەیری حیساب و کتابی خۆی دەکات ، بەندەیەك کە کردەوەکانی یان کردارەکانی خۆی کێشان و پێوانە دەکات، بەندەیەك کە بیری کردۆتەوە لەوەی کە سبەینێ چی ئەنجامداوە لە دونیا لە نامەی کردەوەکانیدا دەیخوێنێتەوە و لە تەرازوەکەیدا دەیبینێتەوە ، بۆ دلی قەدەغەکارە و بەربەست دادەنێ و بۆ ویستەکانیشی فەرمانکارە ، بەندەیەك لغاوی کردەوەکانی دەکات وەك چۆن لغاوی ووشترەکەی دەکرێت ، ئەگەر بردی بەرەو لای گوێرایەلی کردنی (خوای گەورە ) شوێنی دەکەوێت ، ئەگەریش بردی بەرەو لای سەرپێچی (خوای گەورە) ئەوا وازی لێدێنێت کەسێك کە کاروبارەکەی لە (خوای گەورە) پێدەگات ، کەسێك کە گورج و گۆل بووە و هۆشی بەبەردا هاتۆتەوە رقی لە سەر پێچی کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە)ی ئەوا دوو ڕووییە ..؟!

ده‌ڵێن : له‌ دوایی ئه‌م ووتاره‌ی (حجاج) ئه‌وه‌ بوو (مالك كوری دینا ) كه‌ یه‌كێك بوو له‌ تابعینه‌كان یا شوینكه‌وتوان ، ئه‌وه‌ بوو ده‌ستی كرد به‌ گریان ، چونكه‌ قسه‌كانی (حجاج) كاریگه‌و ئامۆژگاری كاربووه‌ ، ئه‌وه‌ش هیچ سه‌یر نیه‌ كه‌ قسه‌كردن جادووی ده‌وێت یان سحری ده‌وێت ، هه‌ر چه‌نده‌ زۆربه‌ی فه‌رمانڕه‌واو زالم و سته‌مكاره‌كانیش زمانیان پاراوه‌ قسه‌كه‌رێكی زۆر باش و ووتار بێژێكی زۆر باش بوونه‌ ، جا هه‌ندێكیان به‌ قسه‌ باقو بریقه‌كانیان ووتاریانداوه‌ بۆ خه‌لك هه‌ندێكیش به‌ سه‌حر و جادوو یان هه‌ندێكیش ته‌نها درۆیان كردووه‌ خه‌لكیان هه‌لخه‌لاندووه‌ وه‌ك ئه‌م سه‌رده‌مه‌، هه‌ر وه‌كو پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : (( أن من البیان لسحرا)) واته‌: له‌ ره‌وان بێژیدا جادوو هه‌یه‌ ..؟!

له‌ (الشعبی) ده‌گێرێته‌وه‌ ووتویه‌تی گوێم لێ بوو (حجاج) ووتارێكی ده‌دا یان ووته‌یه‌كی ده‌ووت كه‌پێشتر شتی وا نه‌وترابوو یان شتی وای نه‌ووت بوو ، كه‌(حجاج) " پاش سوپاس و ستایشی خودا ... ده‌ی ووت : به‌راستی (خوای به‌رز په‌یه‌دار ) چاره‌نووسی دونیای به‌ برانه‌وه‌ و ته‌واو بوون نووسیوه‌ ، چاره‌نووسی دوا رۆژیش به‌ نه‌مری و هه‌تاهه‌تایی نووسیوه‌ ، كه‌واته‌ : شتێك له‌ ناو ناچێت و نابرێته‌وه‌ كه‌ بریاری مانه‌وه‌ی و هه‌تاهه‌تاییبوونی له‌ سه‌ر درابێت ، شتێكیش نامێنێته‌وه‌ و به‌ده‌وام نابێت كه‌ بریاری برانه‌وه‌ و ته‌واوبوونی له‌ سه‌ر درابێت، كه‌واته‌: با ئه‌وه‌ی له‌ دونیا ده‌یبینن هه‌ن و له‌ ناویدا گومراتان نه‌كاو هه‌لتان نه‌خه‌له‌تێنێت و بێ ئاگاتان نه‌كا له‌ نه‌بینراو و نادیاری دوا رۆژ ، هیوای نه‌براوه‌ و دوو رووردرێژتان له‌گه‌ل ته‌مه‌نی كه‌م وكورت تاندا یه‌ك بخه‌ن " ..؟!

له‌ (ابی عبدالله‌ ی سه‌قه‌فی ) ئه‌ویش له‌ مامیه‌وه‌ ده‌لێت : بیستم له‌ (حسن بصری ) ده‌ی ووت : ووته‌یه‌ك زۆری ترساندم كه‌ له‌ (حجاج)وه‌ بیستم له‌ سه‌ر ئه‌م مینبره‌ (حجاج) ده‌ی ووت : " هه‌ر به‌نده‌یه‌ك كات ژمێرێك له‌ ته‌مه‌نی له‌ شتێكدا به‌سه‌ر به‌رێت كه‌ بۆ ئه‌و شته‌ دروست نه‌كراوه‌ ئه‌وا ره‌نگه‌ رۆژی قیامه‌ت داخ و په‌ژاره‌ی درێژ بكێشێت " ..؟!

له (شرکی قازی ) له (عبدالملك کوری عومه‌یر ) ده‌لێت : (حجاج) جارێکیان ووتی : هه‌ر که‌س کارێکی قورسی بۆ ئه‌نجام دابێن به ئه‌ندازه‌ی خۆی پاداشتی ده‌ده‌ینه‌وه ..!!

ئینجا(پیاوێك ) هه‌ستایه‌وه ووتی : پاداشته‌که‌م بده‌رێ ، چونکه من (حسین کوری علی )م کوشت..!!

(حجاج) ووتی: چۆن کوشتت ..؟!

ئه‌ویش ووتی: رمێکم لێدا ، لێدانێکی به زه‌بر ئینجا به شمشێ له‌تم کرد چۆن له تکردنێك و هیچ که‌سیش به‌شدار نه‌بوو له‌گه‌لم له کوشتنه‌که‌یدا ..!!

(حجاج) ووتی : برۆ سوێند به‌خوا تۆ و ئه‌و له یه‌ك شوێنیشدا کۆنابن و یه‌ك ناگرنه‌وه ، هیچ شتێکی پێ نه‌دا ..!!

له( هیثم کوری عدي ) ده‌لێت : پیاوێك هاته لای (حجاج) ووتی : براکه‌م له‌گه‌ل (کوری ئه‌شعه‌س ) چووه بۆ جه‌نگ که‌چی خه‌ت هێنراوه به‌سه‌ر ناوی مندا له دادگادا ، وه خه‌زێنه‌داری خه‌لیفه مووچه‌که‌ی بریم ، وه مال و خانووشی رووخاندووم ..؟!

ئینجا (حجاج) ووتی : ئایان ئه‌م پارچه شیعره‌ت بیستووه :

حنانيك من يجنى عليك ———————— وقد تعدي الصحاح مبارك الجرب

والرب ماخوذ بذنب قريبه ———————— ونجا المقارف صاحب الذنب

ئینجا پیاوه‌که ووتی : من بیستوومه (خوای گه‌وره) جیاواز له‌مه ده‌فه‌رموێت :بێ گومان قسه‌ی (خوای گه‌وره)ش راستره نه‌ك ئه‌م پارچه شیعره ..؟!

ئینجا (حجاج) ووتی : (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿ قَالُواْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا شَيۡخٗا كَبِيرٗا فَخُذۡ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٧٨ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ ٧٩ ﴾ [يُوسُف : ٧٨ - ٧٩]

ئینجا (حجاج) ووتی : ئەی خزمەتکار ناوی پیاوەکە بنووسە ، خانووەکەی بۆ دروست بکەوە و مووچەکەی بدەرەوە ، هەروەها برۆ لە ناو خەلکدا چار لێدا بانگەوازی بکە بلێ (خوای گەورە) ڕاست دەکات ، بەلام شاعیر درۆی کرد ..؟!

هەر لە ( هیثم کوری عدي ) دەلێت : لە (ابن عیاش )وە دەگێڕیتەوە دەلێت : (عبدالملك کوری مروان ) نامەی نووسی بۆ (حجاج) کە سەری ( ئەسلم کوری عبدالبکری ) بۆ بنێرە ، کاتێك (ئەسلەم )یان هێنا بۆ لای (حجاج) ئەوە بوو (ئەسلەم ) ووتی : ئەی فەرمانڕەوا تۆ لێرەیت شاهیدیت و ئەمیری باوەردارانیش لێرە نیە ، وە (خوای گەورە) دەفەرموێت : قال تعالی:
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦﴾ [الحُجُرَات : ٦]

ئینجا (ئەسلەم ) ووتی : ئەی فرمانرەوا ، ئەوەی لە بارەی منەوە سەرتاپەی درۆیە و پووچە ، من بە خێوکەر و سەرپەرشتیاری بیست چوار ئافرەتم هیچ کەسێکیان نیە من نەبێت ، هەموویان ئێستا لە بەر دەرگان ..!!

ئینجا (حجاج) فەرمانی کرد کە بیان هێنن ..!!

کاتێك ئافرەتەکانیان هێنا ، یەکیان ووتی : من پوریمە ، ئەوەی تریان ووتی : مامۆژنیمە ، یەکی تر ووتی : من خوشکی مە ، یەکێکی تریش ووتی : من کچی مە ، هەروەها یەکێکی تریش ووتی : من خێزانی مە یان ژنی مە .. پاشان کچێکی بچکۆلەی هەشت نۆ سالان لێی هاتە پێشەوە ، ئینجا (حجاج) ووتی : ئەی تۆ کێت ..؟! ئەویش ووتی : ئەی فەرمانڕەوا ، (خوای گەورە) چاکت بۆ بکات ، منیش کچیمە ..!!

پاشان (حجاج) لە بەردەمیدا چۆکی داد و ئەم پارچە شعیرەی خوێندەوە :

أحجاج لم تشهد مقام بناته ----------- وعماته يندينه الليل أجمعا

أحجاج كم تقتل به إن قتلته ----------- ثمانا وعشرا واثنتين وأربعا

أحجاج من هذا يقوم مقامه ------------ علينا فمهلا إن تزدنا تضعضعا

احجاج إما ان تجود بنعمة ------------ علينا وإما أن تقتلنا معا

واتە: ئەی (حجاج) مەگەر حالی کچەکانی نابینیت ، هەروەها پورەکانی هەموویان بەگشتی ئەم شەو شینی بۆ دەکەن ..!!

ئەی (حجاج) چەند کەسی تر دەکوژیت ئەگەر ئەوت کوشت ..؟! هەشت و دە و دوو چوار (مەبەستی ئەوەیە ئەگەر (ئەسلم ) بکوژێت هەر بیست چوار ئافرەتی کوشتووە کە ئەو بەخێویان دەکات ) ..!!

ئەی (حجاج) کێ هەیە جێی بگریتەوە بۆ ئێمە ، بەزەییت هەبێ نەکەی زیاتر بێ دەسەلات وداماومان بکەیت ..!!

ئەی (حجاج) یان بەخشندەبە یان پێکەوە بیان کوژە ..!!

دەگێرنەوە دەلێن : (حجاج) دەستی بەگریان کرد ووتی : بە خوا سەرتان لێ ناشێوێنم و زیاتر ناتان خەمە تەنگانەوە ..!!

پاشان (حجاج) یەکسەر نامەی نووسی بۆ (عبدالملك کوری مروان ) و هەمان قسەی پیاوەك و کچە بچکۆلەکەشی بۆ باس کرد لە نامەکەیدا ،ئینجا (عبدالملك کوری مروان ) فەرمانی پێ کرد ئازادی بکات ، وە پەیوەندی باش بێ لەگەلیاندا ، لە گەل ئەم کچە بچکۆلەیەش چاکە کار بێت ، وە هەمووکات بەسەریان بکاتەوە ..!!




دەگێرنەوە دەڵێن : رۆژێکیان ووتاری دەدا ، دەی ووت : ئەی خەڵکینە ئارامگرتن لەسەر قەدەغەکراوەکانی (خوای گەورە ) ئاسانترە وەك لە ئارامگرتن لە سەر سزاکانی (خوای گەورە).

ئینجا( پیاوێك ) بۆی هەڵسایەوە و ووتی : ئەی بەڵای لێت دا ئە (حجاج) چەندە روو دارو بێ شەمی ،چی کردەوەیەکەخراپە دەکەیت ، ئەم جۆرە قسانەش دەکەیت ..؟! سەرت لێ تێك چووە..؟!

ئینجا(حجاج) بە پاسەوانەکەی ووت : بیگرن ..!! کاتێك لەو ووتارەکەی بوویەوە...

(حجاج) بە پیاوەکەی ووت : چی وای لێکردی ئەو خیرەتە یان ئەو بوێریەت هەبێ ئەو قسەیە بکەیت لە پێش فەرمانرەواکەت بوێریت هەبێ قسە بکەی بەم شێوەیە ..؟!

پیاوەکەش ووتی: ئەی بەلا لیچت دا ئەی (حجاج) تۆ چۆن دەوێریت و بوێریت هەیە قسە بە خوا بلێت ..؟! منیش چۆن نەوێرم بەرامبەر تۆ هیچ بلێم ..؟! جا تۆ چیت تا نەتوانم بەرانبەرت دەم بکەمەوە لە کاتێکدا تۆ بەرانبەر (خوای گەورە) ی هەموو جیهان دەمت دەکەیتەوە ..؟!

ئینجا ( حجاج) ووتی : لەم پیاوە گەرێن با بروات بەرێیی خۆیدا وازی لێ بهێنن ..!!

دەگێرنەوە وەك باسمان کرد لە پێشدا ، دەڵێن : دوو دیل یان هێنا لە پیاوانی (کوری ئەشعەس).

ئینجا(حجاج) فەرمانی کرد سەریان بپەرێنن ..!!

یەکێك لە دوو دیلە کە هاتە قسەو ووتی : ئەی فەرمانرەوا من حەقێکم هەیە لە لای تۆ ..؟!

(حجاج) ووتی : ئەو حەقە چیە ..؟!

ئەویش ووتی: رۆژێك (کوری ئەشعەس ) باسی دایکتی دەکرد ، منیش وەلامم دایەوە..!!

(حجاج) ووتی : کێ دەلێت راست دەکەیت ، (شایەتت کێیە ..؟! )

ئەویش : ووتی : ئەم هاورێ دیلەم کە لەگەلمدا بە دیل گیراوە (مەبەستی دیلی دووەم بووە)..!!

دیلی دووەم بانگ کرا بۆ شایەتی ، ئەویش : ووتی سوێند دەخۆم کە راست دەکات..!!

(حجاج)پیٚ ووت : ئه‌ی بۆچی تۆیش وه‌ك هاوڕێکه‌ت به‌رپه‌رچی (کوری ئه‌شعه‌س ) نه‌دایه‌وه ..!!

دیلی دووه‌م ووتی : چونکه من رقم لێته ..!!

(حجاج) ووتی : ئه‌مه‌یان به‌ربده‌ن له‌به‌ر ئه‌وکاره‌ی که‌کردی (مه‌به‌ستی به‌گری له دایکی کرد دیلی یه‌که‌م ) ئه‌وه‌ی تریشیان دیلی دووه‌م بوو له به‌ر راست گۆیی به‌رانبه‌ر (حجاج) نه‌ترسا ..!!

له (واقیدی ) یه‌وه ده‌گێرێته‌وه که (حجاج) جاریدا بانگه‌وازی کرد له ناو خه‌لکی هه‌ر که‌س پاش نوێژی عیشا له مال بچێته ده‌ره‌وه ئه‌وا له ملی ده‌درێت و ده‌کوژرێت سزایه‌که‌ی ئه‌مه‌یه ..؟!

ئینجا شه‌وێکیان پیاوێکیان گرت و هێنایانه بۆلای (حجاج) ..!!

(حجاج) پیٚ ووت : بۆچی هاتیته‌ده‌ره‌وه به‌م شه‌وه دره‌نگه ، ئه‌ی بانگه‌وازیه‌که‌ی ئێمه‌ت نه‌بیستووه ..؟!

پیاوه‌که‌ش ووتی : سوێند به‌خوا من درۆناکه‌م ئه‌یٔ فه‌رمانڕه‌وا ، دایکم نه‌خۆش و په‌ککه‌وته‌یه ، من سیٚ رۆژه لا ئه‌و بوومه ، ئه‌کاته‌ی که چاك بوویه‌وه ، ووتی : کوره‌که‌م من سوێندت ده‌ده‌م له‌به‌ر ئه‌و مافه‌ی هه‌مه به‌سه‌ر ته‌وه برۆیته‌وه لای خاو خێزانه‌که‌ت ، ئێستا ئه‌وان خه‌فه‌ت ده‌خۆن که دواکه‌وتیت له گه‌رانه‌وه‌ت بۆ لای ئه‌وان ..!! ئینجا که له لای دایکم ده‌رچووم پاسه‌وانه‌کانت من یان گرت و هێنایانم بۆ لای تۆ ئه‌وی فه‌رمانڕه‌وا ..!!

ئینجا(حجاج) به پیاوه‌که‌ی ووت: ئێمه لیٚ تان قه‌ده‌غه ده‌که‌ین ئێوه‌ش سه‌رپێچی ده‌که‌ن ..؟!

پاشانی فه‌رمانی کرد سه‌ری بپه‌رێنن ..!! کوشتیان ..!!

دەگێرنەوە دەڵێن: پیاوێکی تریان هێنایە لای (حجاج) .

(حجاج) پێی ووت : چ کارێك بەکاتەی شەو تۆی هێناوەتە دەرێ ..؟!

ئەویش ووتی : سوێند بەخوا درۆ ناکەم ..!! پیاوێك هەندێك پارەو دەرهەمی لابوو بەزۆر لەبەر دەرگای مالەکەیان دانیشاندم ، ووتی : لێت جیا نابمەوە بە حەقی خۆم نەبێت (مەبەستی ناهێلم برۆی تا پارەکەم نەدەیتەوە ) ، کاتێك درەنگ داهات و گەیشتینە ئەم کاتەی شەو ، ئەویش چووە مالەوە و دەگاکەی داخست و لە بەردەگاکەی بە تەنیا مامەوە منی جێهێشت ، ئینجا دواتری پاسەوانەکانت منیان گرت هێنامیان بۆ لای تۆ ئەی فەرمانرەوا ..!!

ئینجا(حجاج) ووتی : سەری بپەرێنن .. کوشتیان ..!!

دەگێرنەوە دەڵێن : پیاوێکی تریشیان هێنا بۆ لای (حجاج) .

(حجاج) پێ ووت: لەم ساتە دەرنگەی شەوە چ کارێك تۆی هێناوەتە دەرەوە..؟!

پیاوەکەش ووتی : لە گەل کۆمەلێك هاورێم لە مەیخانە بووین دەمان خواردەوە، وە کاتێك سەر خۆش بووم لە لای ئەوان هاتمە دەرەوە و ئیتر چی تر نازانم منیان هێناوە تە ئێرە بۆلای تۆ..؟!

ئینجا(حجاج) پیاوێکی لە تەنیشت بوو پێی ووت : سوێند بەخوا راستگۆ دێتە بەر چاوم ..!!

پاشان (حجاج) ووتی : رێگەی پێ بدەن بروات ، ئەویش رۆیی بەرێی خۆیدا ئازادیان کرد ..!!

لە (محمدی کوری زیاد کوری ئەعرابی ) دەگێریتەوە باسی کردووە ، دەلێت : پیاوێك هەبوو لە بەنی (حنیفە ) ناوی( جحدر کوری مالك ) ئەو پیاوە پەلاماری خاکی یەمامەی یان (یەمەنی ) دابوو ، ئینجا (حجاج) نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستی خاکی یەمەن ، بۆ ئەوەی ئەم پیاوەی بۆ بگرێت ، لە نامەکەیدا هەرشەی لە کاربەدەستەکە کرد بوو ، وە زۆر سەرزەنشتی کردو پلاری تیَ گرت بوو ،لەسەر ئەوەی کە پیاوەکەی نەگرت بوو ، هەر بۆیە بەردەوام ئەم کاربەدەستەی خاکی یەمەن بەدوای ئەم پیاوە دا دەگەرا کە ناوی (جحدر کوری مالك ) ، ئینجا رۆژێکیان گرت ناردی بۆ (حجاج) لە عێراق ..؟!

(حجاج) پیَ ووت : چی وای لیَ کردی ئەوە بکەیت کە کردت ..؟!

ئەویش وەلامی دایەوە ووتی : دلّ نەترسی خۆم ، هەروەها بیَ باکی بەدەمەوە نەهاتنی فەرمانرەوا یان (سولتان ) گە فەرماندە تاقی بکردمایەتەوە ، دەیبینی کە یەکێکم لە هاوکارە هەر باشەکانی خۆی ، هەر گیز سوارچاکێکم نەبینیوە لەخۆم بە باشتر و بەتواناتر ..!!

(حجاج) پیێ ووتی : ئێمە دەتخەینە یان دەتهاوێنە نێو حەدیقەیەکی گەورە یان بێستانێکی گەورە ، ئینجا شێرێکی قەپگر کەلپە تیژ یان ددان تیژی تێدا بێت ، ئەگەر ئەم شێرە تۆی خوارد و قەپی لێدای ئەوا ئێمە مردنەکەتمان بەسە ..!! ئەگەریش تۆ شێرەکەت کوشت ، ئێمە وازت لیَ دێنین و ئازاد دەکەین برۆی بەریَ خۆت دا ..؟!

پاشان رەوانەی زیندانی کرد بە دەست بەستراوی و دەستی راستی لە ملی دا بوو ، ئینجا (حجاج) نامەی نووسی بۆ نوێنەرەکەی خۆی لە (کسکر) کە شێرێکی گەورە و برسی بۆ رەوانە بکات ..؟!

ئینجا (جحدر کوری مالك ) لە زیندان دا چەند پارچە شیعرێکی دەووتەوە ، کەتێدا خەفەتباری خۆی دە ردەبری بۆ ژنەکەی و کەناوی ( سولەیمای ئوم عمر ) بوو ..!!

کاتێك شێرەکەیان گەیاند لای (حجاج) ئەویش فەرمانی کرد سێ ڕۆژ برسیان کرد ، پاشان هاویشتیانە ناو حەدیقە کە یان بێستانەکەوە ، فەرمانکرا دەستی (جحدر ) بکەنەوە بەلام دەستی ڕاستی هەر وەك خۆی لە ملی دا مایەوە ..!! شمشێرێکیان دایە دەستی چەپی ...

ئینجا لە گەل شێرەکە ڕوو بەڕوو بوویەوە ، (حجاج) و هاوەلەکانیشی سەیریان دەکردن ، (جحدر ) بەرەو لای شێرەکە دەڕۆیشت ئەم پارچە شیعرەی دەووت :

ليث وليث في مجال ضنك----------- كلاهما ذو أنف ومحك

وبطشة وصولة وفتك ------------ إن يكشف الله قناع الشك

فهو أحق منزل بترك

کاتێك شێرەکە نەرەیەکی توندی کرد ، خۆی کێشایەوە و بەرەو ڕووی هات ، کە ئەندازەی ڕمێکی مابوو لێیەوە ، شێرەکە بازێکی توندی دایە سەر (جحدر) ، ئینجا ئەویش بە شمشێرەکەی ڕەنگاری بوویەوە ، ولێدانێك لێی دا کە تاکو سەری شمشێرەکەی تێکەل بە هەناوی بووی شێرەکەی کرد ، ئینجا شێرەکە کەوتە سەر زەوی دەی ووت چادرە یان ڕەشمەلە ڕەشەبا دەیدات بە زەویدا ، بە هۆی توند لێدانەکەوە ، (جحدر)یش کەوتە سەر زەوی لە بەر ئەوەی شێرەکە زۆر توند بازی دابووە سەری ، هەروەها لەبەر ئەوەی کۆت زنجیرشی لێ ئالێنرا بوو زۆر توند بوو ، ئیدی (حجاج) تەکبیری کرد و هاوەلانیش بەدوایدا ..!! پاشان (حجاج) سەر پشکی کرد کە ئەگەر ویستی لای ئەو بمێنێتەوە لە بەر ئازایەتی و جوامێری و سوار چاکیەکەی ، ئەگەریش حەزدەکات با بڕوات و ئازاد بێت ، بگەڕێتەوە بۆ شارەکەی خۆی ، ئەویش مانەوەی لە لای (حجاج) هەلبژارد ، ئینجا خەلات پاداشت و هەندێك پارەی باشی پێ درا ..!!

دەگێڕنەوە دەڵێن : ڕۆژێکیان (حجاج) نەکۆڵی کرد کە (حسین کوری علی ) لە نەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت ..!! چونکە کوری کچەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ ..!! زانایەکی ئەم سەردەم کە ناوی (یەحیای کوری یعمر ) پێی ووت : ئەی (حجاج) درۆت کرد ..؟!

(حجاج)یش ووتی : لە سەر ئەوەی کە ووتت ، بەلگەیەکم بۆ دەهێنیت لە قورئانی پیرۆزدا ، ئەگەر نا لە گەردنت دەدەم ..؟!

ئەویش ووتی : (خوای گەورە) دەفەرموویّت : قال تعالی: ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ كُلًّا هَدَيۡنَاۚ وَنُوحًا هَدَيۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٨٤﴾ [الأَنْعَام : ٨٤]

ئینجا (یەحیا کوری یعمر ) ووتی : بە پێ ئەو ئایەتە بێت ، (عیسی ) لە نەوەی (ابراهیم)ە کە ویش لە نەوەی (مریم )ە ، (حسین)یش کوری کچی پێغەمبەری خوایە ﷺ ..!!

ئینجا (حجاج) ووتی : راست کرد ، پاشان دووری خستەوە بۆ خۆراسان ..!!

لە (ئەصمعی ) دەگێڕێتەوە دەڵێت : کە (عبدالملك کوری مروان) نامەی نووسی بۆ (حجاج) و پرسیاری لێکرد لە بارەی دوێنی و ئەمڕۆ و سەبەینێ ..؟!

(حجاج) بە نامە هێنەکەی ووت : ئایا (خوەیلیدی کوری یزید کوری معاویە)ی لە لا بوو ..؟!

ئەویش ووتی : بەڵێ .

(حجاج) بۆ (عبدالملك کوری مروان )ی نووسیەوە و وەلامی نامەکەی دایەوە بۆی ..!!

(حجاج) ووتی : سەربارەت بە دوێنی تەوابوو و کۆتایی پێهاتووە ..!! وە ئەمرۆکەش کاتی کارو کردەوەی چاکە ..!! وە سەبەینێش یان بەیانیش کاتی هیواو ئومێدە ..!!

له (محمدی كوری المستورد الجمحی ) ده‌گێڕێته‌وه ده‌ڵێت :ڕۆژێكیان دزێكیان هێنا بۆ لای (حجاج) هێنا ..!!

(حجاج) پێی ووت : وا دیاره باش ده‌وله‌مه‌ند بوویت ..؟! به‌و دزیه تا تاكو بریار بده‌ین ده‌ستت ببرین ..!!

پیاوه دزه‌كه‌ش ووتی : ئه‌گه‌ر خاوه‌ن ده‌ست كه‌م كورتی كرد ئه‌وا ده‌روون سه‌ركێشی تاوان ده‌كات ..!!

ئینجا (حجاج) ووتی : ده‌ستی ببرن ..!! ده‌ستیان بری ...

ده‌گێڕنه‌وه‌ده‌ڵێن : ڕۆژكێكیان (حجاج) له‌گه‌ل (ولید كوری عبدالملك كوری مروان ) یاری ئه سه‌رده‌میان ده‌كرد ، كاتێك له یارییه‌كه ته‌وابوون ، (ولید) بانگیشتی (حجاج)ی كرد بۆ شه‌راب خواردنه‌وه یان مه‌ی خواردنه‌وه ..؟!

(حجاج) ووتی : ئه‌ی ئه‌میری باوه‌رداران ، هه‌ر تۆ حه‌لالت كردبێ حه‌لاله ..!! به‌لام من قه‌ده‌غه‌م كردووه له سه‌ر كاربه‌ده‌سته‌كانم و پاسه‌وانه‌كانم شوێن كه‌وتووه‌كانم كه مه‌ی بیخۆنه‌وه ..؟!

(حجاج) ووتی : هه‌ر بۆیه حه‌زناكه‌م پێچه‌وانه‌ی ئه‌و ووته‌یه‌ی (صالح)پێغه‌مبه‌ر – علیه السلام– كه (خوای گه‌وره ) له قورئانه‌كه‌یدا ده‌فه‌رموویێت : قال تعالی:﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ٨٨﴾ [هُود : ٨٨] ..!!

له (ئه‌صمعی ) ده‌گێڕێته‌وه ده‌ڵێت : ڕۆژێكیان (عبدالملك كوری مروان ) ڕووی كرده (حجاج) پێ ووت : هیچ كه‌س نیه ، عه‌یبی خۆی نه‌زانێت تۆش عه‌یب و عاری خۆتمان بۆ باس بكه ..؟!

ئینجا(حجاج) ووتی : ئه‌ی ئه‌میری باوه‌رداران بمبه‌خشه ... ئه‌میریش وازی لێ نه‌هێنا ..!!

(حجاج) ووتی : من ورگن و قین له دڵ و چاو چنۆك یان به‌ته‌ماع و (حه‌سوود)م ..!!

(عبدالملك كوری مروان ) ووتی : جا خۆ شه‌یتانیش له‌و سیفه‌تانه خراپتری نیه ..؟!یان ده‌ڵێن : پێی ووت : كه‌واته : له نێوان تۆو شه‌یتان خزمایه‌تی هه‌یه..؟!

(ابن كثير ) دەلێت : بە گشتی (حجاج) نیقمەت (پێ نواند)ی یان تاقی كردنەوە (خوای گەورە) بوو بە خەلكی عێراق لە سەر ئەو كارو كردەوە و تاوانەی كە پێشتر ئەنجامیان دابوو ، وە لە پێشەوا چاكەكان راپەرین و هەلگەرانەتەوە لێیان و پیشتیان تێكردن و سەرپێچی و دژایەتیان كردوون ، ئا بەم جۆرە كەسێتی (حجاج) لە نا وەختیدا چەندین سیفەتی دژیەكی هەلگرتبوو تاكو یەك بەلگە و شێوە بدان بەدەستەوە ، گە وە وەلی ئەمرو فەرمانرەوا و ستەمكار و زالم و پاشا زەمانە لوسەكان دەچوو ، زمانی لوس رەوانبێژیان كردبوویە شەیتانی خۆیان خەلكیان پێ گومرا دەكرد ، تاكو خەلكی وا گومانیان دەبرد كە ئەوانە ژیرترین و دادپەروەرترین كەسن ، ئینجا (حجاجی كوری یوسفی سەقەفی ) خۆی لە خۆێدا نزیك دەكردەوەبە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، وە خۆی دوور دەخستەوە لەنەخواردنەوەی شەراب مەی و بادە ، كەچی خەلكیشی بەناحەق دەكوشت خوێنی خەلكی دەرشت ، هەروەها خەلكی ئازاردەدا زیندانی دەكرد زیندانەكانی پر بوون لە خەلكی بێ تاوان ، بە گومانێك لە لای خەلیفەی موسلمانانی ئەو كاتی لە بەر دل خاتری خەلیفە (عبدالملك كوری مروان ) ئەم كارانەی دەكرد تەنها بۆ ئەوی دلی خەلیفە رازی بكات ، هەر كەسێك لە خەلیفە دەرچوو بایە یان راپەرینی بكردایە و هەلبگەرابایەوە ئەوا (حجاج) ئەو كەسەی بە بێ باوەر كافر دادەنا یەكسەر بریاری سەر برینی بۆ دەردەكردو دەبوایە دەست بەجێ بكوژرێت ، یان (حجاج) رەوشتێكی نارشرنی تری هەبوو ئەویش زۆر بێ شەرمانە و بێ رەوشتانە جنێوی بە هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدا ئازاری دەدان و بە ئەوانەی لە ژیان مابوون وەك (ئەنس كوری مالك ) و (عبدالله كوری جابر ) و (سەهلی كوری سعد) – خوا لێیان رازی بێت– هەروەها قسەی بە (عبدالله كوری مسعود ) پێ ووتبوو ( ئەو سەرۆكی دوو رووەكانە ، گەر دەستم پێی گەیشتایە زەویم تێراو دەكرد بە خوێنی ئەو ..؟!

زۆبەی زانایان دەلێن : هەر كەسێك جنێو بە هاوەلانی پێغەمبەر ﷺ بدات ئەو بێ باوەر بوو كوفری كردووە، جا لێرەدا هەندێكیان (حجاج) یان بە كافر داناوە ، هەندێكیشیان رای جیاوازیان هەیە لە سەر بێ باوەری یان كافر بوونی ئەو زالم ستەمكارەی دەولەتی ئەمەویەكان ..؟!

دەگێڕنەوە دەڵێن :

" جارێکیان (حجاج) لە نێو کۆشکەکەی دانیشتبوو ، کە دیمەنێکی زۆر جوانی هەبوو ، هەندێکیش لە گەورە پیاو ماقولانی خەڵکی عێراق لە لای دانیشتبوون ، لە پڕ منداڵێکی هات کە ئەوان پێیان دەووتن : هەڵگراوەکان یان (خروج لە دەولەتی ئەمەویەکان ) یان خواریجەکانی ئەو سەردەم ، منداله هەڵگەراوەکە تەمەنی نزیکەی (١٠) دەبوو ، زۆر بە لێزانی ژیرانە لە (حجاج) بە ژووریٚ کەوت ، هیچ خۆی تێك نەدەدا هەر تەماشاو سەیری ئەم کۆشکەی (حجاج)ی دەکرد ، سەیری دار بەرد و دیوارەکانی و شتەکانی ناو کۆشکەکەی دەکرد ، چونکە بیری لەم دیمەنە سەرج ڕاکێشە دەکردەوە ، هەروەها لە ڕاست و چەپەوە ئاوری دەدایەوە ..! ! پاشان ئارامی نەما دەستی کرد بەقسەکردن بە (حجاج) ووت : (أتبنون بكل ريع ايه تبعثون ) واتە: ئەم هەموو شتەت دروست و تێکەڵاو کردووە ..؟!

کاتێك (حجاج) ئەمەی بیست لە منداڵەکە ، ئەو پاڵی دابوویەوە یەکسەر هەستاو دانیشت ..! !

(حجاج) بەمنداڵەکەی ووت : (أحفظت القرآن ) واتە: ئایا قورئانت لە بەرکردووە ..؟!

منداڵەکە ووتی : بۆ دەترسی قورئان بفەوتیٚ تاکو من حیفزی بکەم و بیپارێزم ..؟! دە سوێند بەخوا قورئانم پاراستووە ..؟!

(حجاج) ووتی : (أفجمعت القران ) واتە: ئایا قورئانت کۆ کردووتەوە ، (هەر مەبەستی لەبەر کردن بوو) ..؟!

منداڵەکە ووتی: خۆ قورئان بلاو نەبۆتەوە تاکو کۆی کەمەوە ، (مەبەستی قورئان هەر هەمووی لە سینگی دایە ) پەرشوو بلاو نیە تا کۆی بکاتەوە ..؟!

(حجاج) ووتی: (أفاحطمت القران ) واتە : ئایا قورئانت ڕێك و پێك کردووە ..؟!

منداڵەکە ووتی: خۆ قورئان بە خۆی تەواو یان کامل و ڕێك و پێك دابەزیوە هیچ کەم کوری تێدا نیە ..؟!

(ابن كثير ) دەڵێت (اي الحكم الذي لا يأتيه الباطل من بين يديه ولا من خلفه )

(حجاج) ووتی : (أستظهرت القران )..؟! واتە: قورئانت دیار خستووە ..؟! (مەبەستی بانگەوازیت بۆ کردووە ، وە لە بەرت کردووە یان لێ تێگەیشتی )..؟!

منداڵەکە ووتی: پەنا بوخوا کە قورئان دابنێم لە پشتەوەم ..!!

ئینجا (حجاج ) بەم ووتانەی ئەم منداڵە زۆر توورە بوو ..!!

(حجاج) ووتی : هاوار بۆ تۆ خوا بتکوژێ ئەدی چی بڵێم ..؟!

منداڵەکە ووتی : هاوار بۆ تۆ و قەومەکەت بڵێ (أو عیت القران ) واتە: ئایا قورئانت لەبەر کردووە..؟!

(حجاج) ووتی : هەندێك قورئان بخوێنەوە ..؟!

منداڵەکە ( دەستی کرد بە خوێنەوەی قورئانی پیرۆز ووتی : بسم الله الرحمن الرحیم : ( إذا جاء نصر الله والفتح و رأیت الناس (یخرجون ) في دین الله أفواجا) واتە : بەمەبەست قورئانی بە هەلە خوێندەوە ، لە جیاتی بڵێ (یدخلون ) ووتی : (یخرجون ) ..!!

ئینجا (حجاج) ووتی : هاوار بۆ تۆ بڵێ (یدخلون ) واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ لە دوای فتح کردنی مککە خەڵکی پۆل پۆل و دەستە دەستە دەهاتن بۆ ناو ئیسلام ..؟!

منداڵەکە ووتی : ڕاست دەکەیت پێش تۆ دەهاتن بەڵام ئێستا (یخرجون ) واتە : ئێستا خەڵکی دەردەچن بە پێچەوانەوە ..!!( مەبەستی بەهۆی زوڵم ستەم و خوێن ڕشتن (حجاج) خەڵکی لە ئیسلام دوور دەکەونەوە )

(حجاج) ووتی : بۆچی خەڵکی دەردەچن لە ئیسلام ..؟!

منداڵەکە ووتی : لە بەر کارە خراپەکانت ..!!

ئینجا(حجاج) ووتی : تۆ ده‌زانی قسه‌ له‌گه‌ل کێ ده‌که‌یت ..؟!

منداله‌که‌ ووتی : به‌لێ زۆر چاك ده‌زانم قسه‌ له‌گه‌ل کێ ده‌که‌م ، له‌گه‌ل شه‌یتانی نه‌وه‌ی سه‌قه‌فی که‌ ناوی (حجاجی کوری یوسفی سه‌قه‌ف ) یه‌ ..!!

(حجاج) ووتی : ئه‌ی هاوار بۆ تۆ کی وا په‌روه‌رده‌ی کردی ..؟!

منداله‌که‌ ووتی : ئه‌وی که‌ منی چاندووه‌ ..!!

(حجاج) ووتی : کێ دایکته‌ ..؟!

منداله‌که‌ ووتی : ئه‌وه‌ی که‌ لێی بوومه‌ دایکمه‌ ..!!

(حجاج) ووتی : له‌ کوێ له‌ دایکت بوویت ..؟!

منداله‌که‌ ووتی : له‌ یه‌کێك له‌ بیابانه‌کان ..!!

(حجاج) ووتی: ئایا تۆ شێتیت تاکو من چاره‌ سه‌رت بکه‌م ..؟!

منداله‌که‌ ووتی : ئه‌گه‌ر شێت بام نه‌ده‌توانی بێمه‌ لات دابنیشم ..!!

(حجاج) ووتی : سه‌باره‌ت به‌ ئه‌میری باوه‌رداران چی ده‌لێی ..؟! (مه‌به‌ستی (عبدالملك کوری مروان ) بوو .

منداله‌که‌ ووتی: ره‌حمه‌تی خوا له‌ (ابو حسن ) خوا بیباته‌ به‌هه‌شته‌وه‌ ..!!( مه‌به‌ستی ئیمامی علی ) – خوا لێ رازی بێت –

(حجاج) ووتی : مه‌به‌ستم ئه‌و نیه‌ به‌لکو (عبدالملك کوری مروان ) ..؟!

منداله‌که‌ ووتی: له‌عنه‌تی یان نه‌فره‌تی خوا له‌سه‌ر ئه‌و بێ دین و فاسقه‌ بێت ..!!

(حجاج) ووتی : هاوار بۆ تۆ چۆن تۆ شیاوی ئه‌و نه‌فه‌رت یان له‌عنه‌تیه‌ی ده‌که‌یت ..؟!

منداله‌که‌ ووتی : له‌به‌ر ئه‌وه‌ هه‌له‌یه‌کی یان خراپه‌یه‌کی ئه‌وه‌نده‌ گه‌وره‌ی کردووه‌ که‌ ئاسمان و زه‌وی پر کردووه‌ ..!!

(حجاج) ووتی : ئەم هەڵەی کردووە چی یە، یان ئەم خراپەیە چی یە(عبدالملك کوری مروان ) کردوویەتی ..؟!

منداڵەکە ووتی : تۆی لە پاش خۆی داناوە بە گەورەو فەرمانڕەوای موسڵمانان کە خوێنیان بە حەلال دەرێژی و مالیان تالان و داگیر دەکەیت ..!!

(حجاج) ووتی : بە گەورە پیاوانی دەورو بەری خۆی ئێوە راو بۆ چوونتان چی یە لە سەر ئەو منداڵە ..؟!

ئەوانیش ووتیان : سەری ببرەو خوێنی برێژە ..!! ئەوە لە گوێرایەڵی ئەمیری باوەر داران دەرچووە هەلگەراوەتەوە خۆی لە کۆمەل جیا کردۆتەوە ..!!

منداڵەکە ووتی : ئەی (حجاج) دەزانی پیاوانی فیرعەونی برات زۆر باشتر بوون لە تۆ ، بە فیرعەونیان دەووت : (موسی و هارون ) –علیهم السلام – دەر بکە لە ولات بە دووریان بکە ، بەلام پیاوانی تۆ دەلێن : کە من بکوژن سوێند بەخوا ئەوە دەبێتە بەلگە لەسەرت لە بەرانبەر (خوای گەورە) کە هەموو ستەمکاران زەلیل و ریسوا دەکات ..!!

(حجاج) ووتی : زمانت پاك بکە قسەی زیادە و ناڕەوا مەکە، چونکە من دەترسم یەکسە بەپەلە بریارت لەسەر بدەم یان حوکمت لەسەر بدەم ، ئێستاش (چوار هەزار درهمت ) دەدەمێ ..؟!

منداڵەکە ووتی : پێویستم پێ نیە ، خوا رووت سپی بکات و پاژنە پێ یەکانت بەرز بکات ..!!

(حجاج) بە پیاوەکانی خۆی ووت : ئایا تێگەیشتن چی ووت ، یان مەبەستی چی بوو ..؟!

ئەوانیش ووتیان : نەخێر . ئەمیری باوەرداران یان فەرمانڕەوا زاناترە ..!!

(حجاج) ووتی : (رووت سپی بێ ) واتە : چاوت سپی و کوێر بێ ..!! (پاژنەی پێت بەرز بێ ) واتە: لە سێدارە بدرێیت هەلبواسرێت ..!!

(حجاج) بە منداڵەکەی ووت: ئایا وابوو یان نا ..؟!

منداڵەکە ووتی : ئەی خوا بتکوژێ چۆن تێگەیشتی ..!!

(حجاج) ویستی بیکوژێ ، بەلام یەکێ ووتی : بیبەخشە بە من ..؟!

(حجاج) ووتی : هانی بۆ تۆ بێت ئەی خوا بێ بەرەکەتی بکات ..!!

ئینجا مندالەکە بە پیاوەکەی ووت : نازانم تۆ و (حجاج) کامتان بێ عەقل ترن ..؟!

پیاوەکە ووتی :بۆ چی من ئەوە رزگارت دەکەم لە مردن تۆ ئەوهام پێ دەلێت ..؟!

مندالەکە ووتی : نۆشی گیانم بێت ئەو شەهید بوونە ..!!ئەگەر پێی بەختەوەر بم ، سوێند بە خوا ئەگەر بکوژرێم لە پێناوی خوا پێم باشترە لەوەی کە بچمەوە ناو خانەوادەکەم بە دەست بە تالی ..!!

(حجاج) فەرمانی کرد کە دیاریەکی بدرێتێ پاشان پێی ووت : ئەو سەد هەزار دەهەمیان پێ دایت ، لەبەر ئەوەی مندالی وە زۆریشی ژیرو عاقلی ، هەروەها پشتت بە خوا بەستووە ، بەلام وریابە رێز بگرە لە پیاوانی دەسەلات دار ، بە تایبەتی لە لای ئەوانەی کە لێت نابوورن ..؟!

مندالەکە ووتی: لێ بووردن بە دەست خوایە بە دەست تۆ نیە ..!! سوپاس بۆ (خوای گەورە)یە نەك بۆ تۆ ..!! یا خوا من و تۆ پێکەوە کۆنەبینەوە ، ئینجا مندالەکە ویستی دەربچێ مندالەکان بۆ چوون ..!!(حجاج) ووتی : وازی لێ بهێنن ، چونکە مندالێکی ئەوها ژیرو ئازام نەبینیوە ..!!

ئینجا مندالەکە رۆیشت بەرێ خۆیدا ..!!

دیارە بەرنامەی هەموو کاربەدەستە ستەمکارەکان وایە کە ئەگەر کەسێکی شیاو زاناو دانا ژیر و عاقل ووشیار و هۆشمەند ببینن دەبێ یەکسەر لە ناوی ببەن بیکوژن ، نەوەك جێگای کورسیەکەی لق بکات و بێتە سەر کورسیەکەی دەسەلات و فەرمانڕەوایەکەیان لێ وەربگرێت ، هەر واشە لەم سەردەمە کەسی شیاو زیرەك و دانا ژیر زوو لە ناو دەچن ، چونکە هەمیشە فەرمانڕەواکانی ئێستا کەسی نەشیاو گێل و چەلاو خۆر ماستاو چی و بێ رەوشت و بێ توانا دەکەنە کاربەدەست ، مرۆڤ ئەگەر لە بازار بی بینێ حەزناکات سلاوی لێ بکات ، چونکە ئەوەندە بێ روو بێ شەرم ریسواو سەر شۆرە ، بەلام سەردەم ئەوی کردووە بە کاربەدەست کەچی شیاوی هیچ نیە ..؟!

## راو بۆ چوونی زانایان له‌سه‌ر (حجاج كوری یوسفی سه‌قه‌فی)

له ( أسماء كچی ابو بكر ) – خوالیّ رازی بێت – له سه‌ر (حجاج) ده‌لێت : "له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بیستووه ده‌رباره‌ی نه‌وه‌ی سه‌قیف : كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : (( له نه‌وه‌ی سه‌قیف (كذابا و مبيرا ) درۆزنێك و فه‌وتێنه‌رێك یان هیلاك ده‌ركیّ خه‌لكی هه‌ن ، (اسماء) ده‌لێت: ئێمه درۆزه‌كه‌مان بینی ، هه‌روه‌ها فه‌وتێنه‌ره‌كه یان هیلاك ده‌ركه‌ی خه‌لكی تۆی ، (حجاج) هه‌ستا رۆیشت ئه‌وری نه‌دایه‌وه ..؟! "

(ابن كثیر ) له (البداية والنهاية) (٩/١٥٣) ده‌لێت : " (حجاج) به‌رانبه‌ر (ئیمام علی ) و شوێنكه‌وتوانی ، رق وكینه و دوژمنیان بوو ، ئه‌و بنه‌ماله‌ی ئه‌مه‌ویه‌كانی خۆش ده‌ویست حه‌زی پیان بوو به تایبه‌تی (عبدالملك كوری مروان ) زۆر گوێرایه‌لی ده‌كرد ، وه ئه‌و سته‌مكارێكی سه‌ر سه‌خت بوو ، به بچووكترین گومان بوێری ئه‌وه‌ی هه‌بوو خوێن برێژێت "

هه‌ر له (ابن كثیر ) له (البدايه والنهايه ) (٩/١٣٨–١٣٩) ده‌رباره‌ی (حجاج) باسی كردووه ده‌لێت : " (حجاج) به گه‌نجی كه‌سێكی هۆشیار و زیره‌كه قسه‌خۆش و ره‌وان بێژو فصيح بوو ، قورئانی هه‌موو له‌به‌ر كردبوو "، وه پێشینه‌كان ئه‌وانیش ووتیانه : "(حجاج) هه‌موو شه‌وێك قورئانی خوێندویه‌ته‌وه "، هه‌روه‌ك (ابو عمر كوری العلاء ) ده‌لێت : "هیچ كه‌سێكم نه‌بینوه فصيح بێت وه‌ك (حجاج) جگه له (حسن البصری ) "..؟!

هه‌ر له (ابن كثیر ) باسی كردووه ، له (عقبه كوری عمر ) ده‌لێت : من هه‌ر گیز عه‌قل یا زیره‌كی خه‌لكم له یه‌كتری نزیك تر نه‌بینیوه ، جگه له (حجاج) و (اياس كوری معاويه ) ، چونكه عه‌قل و زیره‌كیان به‌سه‌ر خه‌لكی زۆر بووه یان زال بووه "

لە (ابن كثير ) دەلێت :" (حجاج) شهامەتی گەورەی هەبووە ، شمشێرەکەی تیژ بووە ، ئەو زۆری خەلکی کوشتووە خوێنی رشتوون ، کەچی (خوای گەورە ) کوشتن و خوێن رشتنی حەرام کردووە ، وە (خوای گەورە ) لیّ توورەیە وەکو لە پاشا ستەمکارەکان توورەیە "

لە (ابن كثير ) دەلێت :" رۆژێکیان (عبدالملك کوری مروان ) بە (حجاج) ووت: ئەی (حجاج) دەزانی عەیب و عاری نەفسی خۆت ، وسفی عەیب و عاری نەفسی خۆتم بۆ بکە ، ئەویش : ووتی بم بوورە ئەی ئەمیری باوەرداران ، ووتی : (أنا لجوج حقود حسود ) ئینجا (عبدالملك کوری مروان ) ووتی : (إذا بينك وبين إبليس نسب ) "

لە (قتادة) دەگێرێتەوە باسی کردووە لە (سعیدی کوری جوبیر ) ووتویەتی : " لە (حجاج) خروجم نەدەکرد یان هەلنەدەگەرامەوە ، هەتا ئەو خروجی کردوو هەلگەرایەوە لە ئیسلام وبیّ باوەر بوو"

لە (الاعمش ) دەلێت : جیاوازی هەبوو لەسەر (حجاج) هەر بۆیە پرسیاریان لە (مجاهد) کرد ، ئەویش ووتی : پرسیار لە شیخی کافر دەکەیت "

لە سنن (الترمذي ) لە (عبدالله کوری عمر ) دەگێرێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : لە ( في ثقيف كذاب و مبير ) واتە: " لە سەقیف درۆزنێك و خەلك لە ناوبەرێك یان خەلك هیلاك کەرێك پەیدا دەبن " دەوترێت : درۆزنەکە (موختاری کوری ابو عبيد)ی سەقەفی یە ، لە ناوبەرەکەش (حجاجی کوری یوسفی سەقەفی )یە ، هەروەها لە (هشام کوری حسان ) دەگێرێتەوە دەلێت : "هەژمار کراوە حجاج چەند کەسی کوشتووە ، وەراگەیاندووە بە نزیکەی سەد و بیست هەزار کەسی کوشتووە " ..؟!

لە (الذهبي ) لە سيرة أعلام النبلاء (٣٤٣/٤) باسی دەکات دەلێت : "(حجاج) زالم و ستەمکارێکی زۆر سەر سەخت و پیس بووە ، خوێنی خەلکی رشتووە بە ناحەق "

هەروەها (الذهبي ) دە لیت : (حجاج) تێروانینی وەك ستەمکارو جبابرە فەرمانرەوایەتی کردووە"

